ئەحمەدی موفتی زادە

# چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەین؟



وەرگێڕانی
کامەران حەمەسەعید



# چۆن و لەکوێوە دەست پێبکەین

نوسینی

**ئەحمەدی موفتی زادە**

گفتوگۆو ئامادەکردن و وەرگێڕانی

**کامەران حەمە حەمەسعید**



ناوی کتێب بەکوردی: چۆن و لەکوێوە دەست پێبکەین
نوسینـــــــــــی: ئەحمەدی موفتی زادە
وەرگێڕانـــــــــی: کامەران حەمە حەمەسعید
بڵاوکردنـــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی نـاوەوە: جمعە صدیق کاکە
خـــــــە ت: نەوزاد کۆیی
بـــــــەرگ : أمین مخلص
نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تـــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٨٩) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٢٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چەند تێبینی یەك:

١ـ ئەم کتێبەی بەر دەستت لە دووبەش پێکهاتوە، بەشێکی گفتوگۆیەکی تێروتەسەلە لەگەڵ کاك ئەحمەد خۆی، کە بەندە لە زستانی ساڵی ١٩٩٣ مانگێك بەر لە وەفاتی سازدابو، بەشی دووەمیش پێکهاتوە لە سێ نامیلکە بە ناونیشانەکانی (فیطرەت و هیدایەت، تەزکیە وتەعلیم، دڵی سازونان)، کە لە حەقیقەتی خۆیدا سێ کۆڕوموحازەر بوەو کاك ئەحمەد بە قسە پێشکەشی دۆستانی کردوە، دواتر ئەم سێ کۆڕەیان خستۆتە سەر زمانی نوسین (بەفارسی) و خستویانەتە بەدەستی کاك ئەحمەد خۆی و ئەویش دووبارە پاکنوسی کردۆتەوە، جا ئەمەی بەردەستت وەرگێرانی هەر سێ بابە تەکەیە لە فارسیەکەوە.

چاپی یەکەمی ئەم نامیلکانە لە ساڵی ١٩٩٧_ ١٩٩٨ نوسینگەی تەفسیر ئەرکی لە چاپدانی گرتە ئەستۆ بەبێ بەرامبەر و جێگەی وەفاو ڕێزە، ئێستاش وا هەمویان بە یەکەوە هەمان نوسینگە، واتە: (نوسینگەی تەفسیر) چاپی دووەمیشی دەگرێتە ئەستۆ، هەمویان لە یەك بەرگی قەشەنگ دا.

# بە ناوی خوا

کاتێـك بمـەوێت دەربـارەی نـاوەرۆکی ئـەم کتێبانـە بنوسـم ناچـار دەبێـت دەربارەی خاوەنی ئەم نوسینانە بنوسم و بێ ناسینی کـاك ئەحمـەد تێگەیشـتن لـە نوسـینەکان و بەرهەمـەکانی سـەختتـر ئـەبێت لەبـەر ئـەوە سـەرەتا بـە پێویستم زانی بزانین کاك ئەحمەد کێ یە؟

لـە سـاڵی ١٩٣٢ لـە دایـك بـووە لـە سـاڵی ١٩٩٣ دا کـۆچی دوایـی کـردووە و هەندێك لاپەڕەی ژیانی لە دوتوێی کتێب و گۆڤارەکانـدا بەردەست دەکـەوێت و من دووبارەی ناکەمەوە، هەرچەندە ئەو باسانەش کاڵ و کـرچ و سـادە و سـاکار و سەرپێین، بەڵام ئەوەی من مەبەستمە ناسینی کەسایەتی کـاك ئەحمـەدە کـە بە ئاشکرا ئەم لە کەسانی دی جیادەکاتەوە.

کاك ئەحمەد مێژوونوسێکی ئیسلامی بوو؟

مێژوو ناسێکی ئیسلامی بوو؟

زانایەکی زمانی عەرەبی واتەزانای صرف ونحو بدیع و بەلاغەت بوو؟

زانایەکی فیقهی ئیسلامی بوو واتە پسپۆر لە شـەریعەتدا جا چ مەزهـەبێك یا هەموو مەزهەبەکانی سونە و شیعە؟

عارفێکی ئیسلامی بوو، خاوەنی شێواز و ڕێباز و مەشرەبێکی تایبـەتی بـوو لە تەسەوف و عیرفاندا؟

سیاسەتمەدارێکی ئیسلامی بوو، هەم و غەمی بەرزبوونەوەی ئاسـتی سیاسـی موسڵمانان و حکومەتی وڵاتە ئیسلامیەکان بوو، بە عەمەلی لە ڕێی سیاسەتەوە دەیویست کەم و کوڕی و کێشەو ستەمەکان چارەسەر بکات؟

موفەکیرێکی ئیماندارى ئەخلاقی بوو؟

موفـەکیر لـە ڕووی زمانەوانیـەوە واتـە ئـەو کەسـەی -بیردەکاتـەوە- ئەگـەر چی زانا و پسپۆڕ و توێژەرە جۆراوجۆرەکان لە بوارەکـانی خۆیانـدا پێویسـتیان بە بیرکردنەوە و توێژینەوە هەیە بۆ ئـەوەی بگەنـە ئامانجێـك بـەڵام هـەرگیز

وشەی موفەکیریان بۆ بەکار نایەت زانایەکی کیمیاوی یا فیزیاوی یا مێژوو هەر بە زانا ناودەبرێن. ئەی کەواتە موفەکیر بە کێ دەوترێت؟

لە فەرهەنگی ئێمەدا وشەی ڕۆشنبیر زۆرتر بە وانە دەوترێت خوێنەوارن و مەعلوماتێکی تایبەتیان هەبێت لەسەر ئەدەبیات یان هونەر یان هەرشتێکی تر تەنانەت زۆر جار بچوکتر لەوەش تەنها شەهادەیەکی هەبێت بە ڕۆشنبیر هەژمار دەکرێت، بەڵام پێم وایە موفەکیر بەو کەسە دەوترێت کە دوو خەمی گەورە و بەردەوامی هەیە یەکەم خەمی عەقڵ و دووەم خەمی مرۆڤ، ئەو کەسەی لە خەمی بەگەرخستنی عەقڵی خۆیو هاوجۆرەکانی بێت بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە هەقیقەتی وجود و سەر ئەنجام ژیانێکی باش و لەبار و سازگار لەگەڵ هەقیقەت و پێک هاتەی مرۆڤ ئەو کەسە دەتوانین ناوزەد بکەین بە موفەکیر، لەلای کاک ئەحمەد مرۆڤ دەبێت بە سێ بەشی بنەرەتیەوە

١. لەش - نەفس -
٢. هۆش و زەین - ذهن -
٣. دڵ - ڕۆح و مەعنەویەت -

بە پێی ئەم ناسینە کاک ئەحمەد بەهایەکی گەورەی دەدا بە عەقڵ کە کاراکتەری سەرەکی دنیای هۆش و زەینی مرۆڤە، وێرای ئەمە خەمی دینداری مرۆڤیشی هەبوو وە پێی وابوو کە ئەم مرۆڤە عاقڵە لە سەرەتای ترین تاوتوێدا دەبێت بوونی خوا قبوڵ بکات و دین و داخوازیەکانی بە هەند وەربگرێت و مرۆڤی کامڵ ئەو مرۆڤەیە کە بە کاریگەری و ڕێنمای دینەوە عاقڵانە بکەوێتە ڕێ و سەر ئەنجام خودێکی پێ گەیشتوو و باش و بەهێزبێت بۆ خۆی و هەموو پەیوەندیەکانی چ لەگەڵ مرۆڤ و چ مەخلوقاتی تر، ئەو کەسەی هەم خەمی دنیا و هەم خەمی مەعنەویەتی هەیە هەم بەها بە هۆشی دەدا و هەم بە ڕۆح و هەم بە لەش هەروەها بە ڕێنمایی عاقڵانەی دین هەنگاو هەڵدەگرێت و ڕێبازێکی ساڵحانە دەگرێتە بەر ئەمە ئەو مرۆڤەیە کە بە

بۆچونی کاك ئەحمەد خوا دەیەوێت لەسەر زەوی ئەهلی ئەمانەت و دینداری بێت و مایەی خێر و چاکە و سود و خۆشی و سەلامەتی بێت.

من پێم وایە کاك ئەحمەد موفەکیرە بەم مانایە جا چ ڕۆشنبیر یا وشەی -ئەنتلکۆنێل-ی بۆ بەکاربهێنین، کاك ئەحمەد ئەو کەسەیە بەبەردەوام خەمی گەشە و نەشە و تەکامولی مرۆڤی هەیە بە تایبەتی مرۆڤی کورد.

وێڕای ئەم سیفەت و پێناسەیە کاك ئەحمەد زۆر شارەزا بووە لە زمانی عەرەبیدا و هەروەها لە هەموو زانستەکانی فیقهو تەفسیر و حەدیس و ئەو زانستانەی کە زانا ئاینییەکان لە مزگەوت و حوجرەکاندا دەیان خوێند بۆ نمونە لە زانستی حەدیس دا خاوەنی بۆچونێکی تایبەتی خۆی بوو، کاك ئەحمەد دەیوت وێڕای ئەو پێودانگانەی کە زانایانی حەدیس دایانناوە دەبێت قورئان پێو دانگ و پێوەر و مەحەکی بنەرەتی حەدیس بێت چونکە ناکرێت پێغەمبەر (ﷺ) پێچەوانەی ڕواڵەت و دەروون و مانا و پەیامی قورئان شتێکی وتبێت، واتە پێش هەر پێوەرێك قورئان ساغ کەرەوەی حەدیسی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەمە لە وەوە دێت ئەو باس و توێژینەوە سەرەکیانەی زانایانی حەدیس کردویانە کاك ئەحمەد ئاگادار بووە لێیان و لەگەڵ پێزانینی زەحمەت و کۆششی ئەوان ئەو خاڵەش دیاری دەکات و خەڵك هاندەدات کە ئەو حەدیسانەی بە ناوی پێغەمەرەوە (ﷺ) نەقڵ کراون هەروا بە ئاسان پەسەند نەکەن و لەگەڵ ئەو پێوەرە بنەرەتیەدا کە دیاری دەکات -قورئان- ڕەگەزی ئەقڵیش بە پێویست دەزانێت بۆ ناسینەوەی حەدیسێك بە ناسین و تاوتوێکردنی قورئان و حەدیس و سەردەم و شوێن، هەروەها لە ناسینی مەزهەبەکاندا زۆر بەفراوانی موتاڵای کردووە و زانیاری تەواوی هەبوو لەسەر مەکتەبە فیقیهیەکان و مەزهەبەکان بە شیعە و سونەوە.

مەبەستمان ئەوە بوو کاك ئەحمەد وەك موفەسیرێك یا زانایەکی حەدیس یا زانایەکی شەریعەت یا زانایەکی زمانی عەرەبی یا قازیەکی دینی نەناسراوە، لەگەڵ ئەوەدا لەو بوارانەدا کەم و زۆر شتی نوسیوە و باس کردووە بەڵکو ئەو خەمێکی گەورەی هەڵگرتبوو و لێپرسراویەتیەکی گەورەتر لەمانەی کەوتبوە

سەر شان ئەویش -مەهدیەتە- واتە هیدایەت و ڕێنمایی مرۆڤ بۆ مرۆڤانە ژیان و بەندایەتی نەکردن بۆ هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ بکەنە بەندەی خۆیان و بیخەسێنن و ئاوردانەوە بەرەو بنەڕەت و ئەسڵی خود ئەم ئەرکە دوای تەواو بوونی پێغەمەرایەتی لەسەر دەستی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیزنی خوا و فەرمانی ئەو دەخرێتە سەرشانی دۆستانی تایبەتی خوا کە هەتا ژیان و مرۆڤ هەبێت بەردەوام دەبێت ئەم -مەهدی- ڕێنمایانە کاریان ڕاچەنین و ڕاپەڕینی مرۆڤە لە بەرامبەر هەموو ئەو کۆت و بەندانەی کە بۆیان دروستکراوە ئەرکەکانیان بە پێی سەردەم و شوین جیاوازە و دەگۆڕێت هەر یەکەیان ڕەنگی سەردەم و شوێنی خۆی پێوەیە لە بنەماکاندا چوون یەکن خەڵك بانگ دەکەن بۆ خوا پەرستی و ئازادەگی و جێبەجێکردنی ئەرکی مرۆڤانەی سەر شانیان لەهەر سێ لایەنی پەیوەندیدار بە خودا و خود و خەڵك، واتە ئەرکەکانیان لە بەرامبەر خودا و خود و خەڵکەوە بە باشترین شێوە ئەنجام دەدەن > بەندەی خودان بەندەی هەوا نین، لەبیری دوارۆژدان ئەهلی دنیا نین، فیداکاری خەڵکن نەك خەڵك فیداکاریان.

من نازانم بڵێم کاك ئەحمەد لە کێ دەچوو؟

یان لەگەڵ چ کەسێك دا موقارەنەی بکەم؟

چونکە دەکرێت شاعیرێك لەگەڵ شاعیرێك جوتیارێك لەگەڵ جوتیارێك و مامۆستایەك لەگەڵ مامۆستایەکی تردا موقارەنە بکرێن و ئەنجامێکت دەست کەوێت بەڵام پێم باشە کاك ئەحمەد خۆی بە جیا باسبکەم.

باشترین پێناسە بە لای منەوە بە زمانی ئەم سەردەمە و بەو ناوەرۆکە کە باسم کرد ئەوەیە کە بڵێم کاك ئەحمەد موفەکیرێکی ئیسلامی بوو واتە هەم موسڵمان بوو هەم بەهای تەواوی بۆ ئەقڵ دادەنا هەم بەو پەڕی ڕێزەوە دەیڕوانیە پێشینەی زانستی و فیکری و ڕۆحی و مەعنەوی موسڵمانان هەم باوەڕی وا بوو سەردەم و شوێن -زمان و مکان- دەبێت حسابی خۆی بۆ بکرێت و موسڵمانان لە هەر سەردەم و شوێنێکدا هەقی خۆیانە بە قورئان و سونەتی

عەمـەلی پێغەمبـەرەوە (ﷺ) بیربكەنـەوە بـۆ سـەردەم و وشـوێنی خۆیـان و لـە ئیجتیهادی عەمەلیدا ئازاد بن؟

واتە هەم تەقلید هەم ئیجتیهاد، هەم دەق هەم ئەقڵ، بەوپەری حورمەتـەوە سود وەرگرتن لـە هـەموو ئیجتیهادەكـان بـۆ بەدەسـتهێنانی باشـترین ئەركداری لەگەڵ خەڵكی سەردەم و شوێنی خۆتـدا، كـاك ئەحمەد هـەم -قـال فلان- و -قیل فلان-ی رەچاو كردووە و بەرێزەوە لە بەرامبەریاند هەڵوێستی گـرت هـەم خۆی -اقول-ی كرد. بەڕاستی تـا كـەی بڵێـین -قـال- و -قیـل-، ئـەو كەسـانەی خاوەنی -قال- و -قیل-ن مرۆڤی موسڵمان بـوون وەك ئێمـە و لەبـەر رۆشـنای قورئان و ژیانی رۆشەنی پێغەمبـەردا (ﷺ) ئـەقڵیان بـە پێـی سـەردەم و شـوێنی خۆی خۆیان بەكارهێنا و وتیان؟ كـێ دەڵـێ ئێمـە هـەر دەبێـت وتـەكانی ئـەوان بڵێینەوە و كێ ئەم هەقەی لە مرۆڤی موسڵمان داگیركردووە؟

كێ ئەو هەقە بە زانایەك دەدات بۆ هەموو سـەردەم و شـوێنەكان قسەبكات و هەموانیش پەیڕەوی لێ بكەن؟

كەی یاسای سروشتی و نەزمی ژیانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی وایـە؟ ئایـە ئەمـە خۆی ئیدعای خۆ پەسندیي نیـە؟ كـە تـەنیا مـن هـەقم و ڕسـتگارم و ئەوانـەی لەگەڵ مندان و باقی تری مرۆڤ هەمووی گومڕایە؟

هەق تا لـە ئاسـمانە رەهایـە -مطلقـە- كـە خـوا خـالقی مـرۆڤ و بونـەوەرە بەڵام كەس لەسەر زەوی و هیـچ گروپێك ناتوانێـت ئـەم هەقـە بـۆ خـۆی قـۆرخ بكات و هەموو مرۆڤایەتی لێ مەحروم بكات، ئەم ئیدعایـە توغیانـە و تـاغوتی كردنە و ئیدعای تاك رەوي و خۆ ئەسنديي و (تەنها خۆ بەحـەق زانیـە) نـەك نەجات و فیرقەی ناجیە.

كاك ئەحمەد موسڵمانێكی عاقڵ بـوو كـەجارێكی تـر خوێندنـەوەی بـۆ دیـن كرد و رەچاوی سەردەم و شوێنی كردو سەرەنجام هەم خۆی مرۆڤێكـی كامـڵ و مزكی لێ دەرچوو هەم خودایەك كە باسی دەكات سەرانسەر بەزەیی و رەحـم و كەرەم و خۆشەویستیە، بازنەی تەقلیدی بچوك كردەوە و مەیدانی بە عەقڵ دا بە پشتیوانی خودا و بە رێنمایی قورئـان و ئـەزمونی موبـارەكی پێغەمـەر (ﷺ)

بكەوێتە گەڕ و ناسینی بونەوەر و مرۆڤ و پەیوەندیەكان لە سنورێكی باشدا بە دەست بهێنێت.

كاك ئەحمەد بۆ ئەم ئامانجە گەورەیە هەموو تواناكانی خستە گەڕ بۆ ناسینی دین و مرۆڤ كە دەزانین ئەمە كارێكی تایبەتە و گشتی نیە و هەركەس لەلای خۆیەوە بە مەعلوماتێكی كەم و دیاریكراوەوە ناتوانێت هەڵسێت بە كارێكی ئاوا گەورە، تەنانەت كاك ئەحمەد ماوەی نەدا بە هیچ یەكێك لە پەیڕەوانی ئەم كارە بكەن چونكە دەیزانی كاری هەموو كەس نیە و بەڵام لە ڕێبازی زیاتر ناسینی دین و مرۆڤدا هەرچەند هەوڵ بدەن و ڕێژەی تەقلید لە خودی كاك ئەحمەد و زانایانی تر كەم و كەمتر بكەنەوە و ڕێژەی ئجتهادیان زیاتر بكەن پشتیوانی لێ كردوون و هانی داون، واتە كاك ئەحمەد بەم كارەی بە ئاشكرا دەڵێت من و قسەی من و بیركردنەوە و خوێندنەوەی من ئەڵقەیەكی تری دینداری و خوێندنەوەی دینە، هەمیشەیی و هەتا هەتایی نیە چونكە باش یاسای ئەم ژیانە و مرۆڤی ناسیوە.

كاك ئەحمەد زۆرتر لە هەر زانایەكی بەناوبانگی تری موسڵمان لە سەدەی بیستەمدا باسی لە مرۆڤ كردووە و توێژینەوە و لێكۆڵینەوەی لەسەر كردووە.

ئەم ئامیلكانە باسی مرۆڤ و فیترەت و چۆنیەتی ڕێنمایی و تەزكیە و پەروەردەكردنێتی تا سەرئەنجام ببێتە خاوەنی دڵێكی سازگار جا ئەو كاتە مرۆڤ دەزانێت چۆن و لە كوێوە دەست پێ بكات؟

لە خۆیەوە؟

لە كۆمەڵگاوە؟

لە لایەنی سیاسیەوە؟

لە لایەنی ئابوریەوە؟

لە لایەنی فەرهەنگی و هۆشیاری گشتییەوە؟

لە لایەنی چەكداری و بەدەست هێنانی دەسەڵاتەوە؟

لە خۆیەوە دەست پێ دەكات و هەموو پرسیارەكان بە پێی سەردەم و شوێنی موسڵمانان دەگۆڕێن، بڕوا و بۆچونی هیچ كەس نابێتە ئەو فەرمانەی

کە نەتوانرێت کەس لێی دەربچێت، موسڵمانان لە هەر سەردەم و شوێنێك دا هەل و مەرج و بارودۆخی تایبەتی خۆیان هەیە و دەتوانن باشترین اجتیهاد بەو پەڕی ئیخلاسەوە هەڵبژێرن و ئەگەر هیچ کام لەوانە نەشیا خۆیان اجتیهاد بۆ سەردەم و شوینی خۆیان و کێشەکانیان بکەن { لێرەدا پێم باشە دووبارەی بکەمەوە لەبەر تەفەروقی زیاتر باشترە موسڵمانان لەسەر مەزهەبە ناسراوەکان کار و فرمانەکانیان جێ بەجێ بکەن و مەزهەبێکی تری شەریعەت زیاد نەکەن } لە لای کاك ئەحمەد ئەقڵی بەرگرتوو لە دین دەتوانێت بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و سازگار بەبێ زیادە ڕەووی و کەم ڕەوی مرۆڤ هانبدات بەرەو ڕێو شوێنێکی شایستە، نەفسی مرۆڤ کە لێپرسراوە لە سەرپەرشتی غەریزەکان بە باشی و هەموو لایەنە و موعتەدیل غەریزەکان بەکار بهێنێ و سەرئەنجام غەریزەکان و لەشی مرۆڤ لە خزمەتی کامڵتر بوونی مرۆڤدا بن و ڕۆحی واتە لایەنە مەعنەویەکە کە بە -دڵ- ئاماژەمان پێ کرد -مزکی- دەبێت و سەرئەنجام ئەو مرۆڤە ئاقڵە دیندارە کە خاوەنی نەفسێکی موعتەدیلە و ڕۆحێکی موزکی لەو پەری ئارامی و ئومێد و سەقامگیری و فراوانیدا ژیان دەباتە سەر و هەنگاو هەڵدەهێنێت و زیادەڕەوی و کەم ڕەوی -افراط وتفریط- و توندوتیژی و لەجیاتی خوا قسەکردن و خۆ بە خوا و حاکم زانین و دیاری کردنی چارەنوسی دنیا و دوا ڕۆژی مرۆڤەکان لە بیر و بۆچون و ڕەفتار و هەڵوێستەکانیدا نامێنێت و زیاتر لە هەموو کەس خەمی دڵسۆزانەی خۆیەتی و خۆی بە لێپرسراو لە خۆی دەزانێت نەك لێپرسراو و حاکمی خەڵك و ئامادەکردنی ئاگری دۆزەخ بۆ هەموو نەیارەکانی، دوای هەواوهەوەسی ناکەوێت وەکو کاك ئەحمەد لە وەڵامی کەسێکدا کە دەیویست عەیب و عاری کەسێکی تر باس بکات وتی :-

بەخوا کاکە خۆم ئەوەندە عەیبم هەس

ناپەرژێتە سەر عەیبی کەس

ئەم سیفەتە بەرهەم و بەر ئەنجامی ئەو بۆچونە دینیەیە کە باسمان کرد، ئەمە بە مانای ئەوە نیە کە کاك ئەحمەد خەمی کەسی نەبووە و دڵسۆز نەبوە

بۆ خەڵك بەڵكو دروست بە پێچەوانەوە کاك ئەحمەد بڕوای وا بوو مرۆڤ دەبێت لە خۆیەوە دەست پێ بکات و پاشان بۆ پەیوەندیەکانی تر، چونکە ئەگەر خۆت نەتوانیت خۆت پەروەردە بکەیت و مرۆڤێکی باشت لێ دەربچێت چۆن دەتوانیت کۆمەڵ بە کەسی تر بکەیت؟! هەموو شتەکان لە خودێکی پەروەردە کراوەوە دەست پێ دەکات نمونەی گۆڕانکاری لە حکومەت و کەسایەتیەکاندا و بەردەوامی زوڵم و زۆر و مانەوەی چەوسانەوە و گەندەڵی نمونەیەکی باشە بۆ ڕاستی و دروستی ئەم بۆچونە، ئەگەر قەرارە من ببمە حکومەت و دەسەلات بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەکان و خزم خزمێنە و مەحسوب بازی و مەنسوب بازی بەکار بهێنم و غەدر لە خەڵك بکەم چیم کردووە؟ چیم گۆڕیوە؟

دەم و چاوەکان و ناوەکان و کەسایەتیەکان؟ مێژوو پڕە لەم ئەزموونە تاڵە و کەسایەتیەکان و نوخبەکان و خەڵك دەبێت لە خۆیانەوە دەست پێ بکەن و بگۆڕێن و وەکو مرۆڤ بیر بکەنەوە و پەروەردە بن و باش بن تا بتوانن حکومەتێکی باشو ژیانێکی باش بۆ خۆیان و خەڵك دابین بکەن و مێژوو دووبارەو سەدبارە نەبێتەوە.

ژیانی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بۆ دوو ئامانجی مەزن و پیرۆز تەرخان کراوە

١- تێگەیشتن و خوێندنەوەی ڕاست و دروست لە دین.

٢- پەروەردە و پێگەیاندنی مرۆڤ.

وتمان وێڕای پێزانین و وەفا بۆ فیداکاری و ڕەنج و زەحمەتی زانایانی دینی مێژووی موسڵمانێتی و ڕێزدانان بۆ بۆچون و ڕاکانیان و خوێندنەوە و تێگەیشتنیان و سودوەرگرتن لێیان کاك ئەحمەد بە پێی سەردەم و شوێنی خۆی و دنیای ئیسلام بە پیویستی دەزانێت جارێکی تر دین خویندنەوەی تری بۆ بکرێت و لەگەڵ ئەوەدا هەقدەدا بە زانایانی ڕابردوو و ئەم سەردەمە ئەو هەقەش دەدا بە خۆی دین بخوێنێتەوە و تێگەیشتنێکی تر کە وێك چونی لەگەڵ باقی تری خویندنەوەکاندا هەیە سەرئەنجام خوێندنەوەیەکە تایبەتە.

ئەمەش بە هەقی خۆی دەزانیت کە وەك سەید جمال الدین و محمد عبدە و وەهابیەکان و ئیخوانیەکان و جیهادیەکان سەیری دین و مرۆڤ و ژیان بکات و جۆرێکی تر بۆی بروانێت و تێگەشتنێکی تری هەبێت، ئەمەش ئەو خاڵە گرنگەیە کە کاك ئەحمەد لە کەسانی تر جیا دەکاتەوە چ لە لایەنی فیکرەوە چ لە لایەنی ژیانی فەردیەوە چ لە لایەنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە، ئەمە وا دەکات کاك ئەحمەد پێش هەر شتێك ژیانی خۆی لەگەڵ فیکر و بیرکردنەوەیدا هاوڕەنگ بکات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناکۆکی فیکر و کردەوە و دەرون و ڕواڵەت و فرمانەکانی دین لە لایەك و عادەتی شەخسی و خێزانی و کۆمەڵایەتی کەم و کەمتر بکاتەوە، ژیانی ڕۆژانە و کەسایەتی کاك ئەحمەد سەداقەت و پاکی و ئیخلاسی ئەو مرۆڤە کامڵەی نیشان دەدا. ڕیشەی پەروەردە و کامڵ بوون لە لای کاك ئەحمەد نەهێشتن و کەمکردنەوەی دوو سیفەتی ئیستکبار و ئیترافە ئەم دوو سیفەتە سەرلەبەری بیر و بۆچون و وێنا و ڕەفتارەکانی مرۆڤ دەگرێتە بەر، سیفاتی ئیستکباری وەك خۆ بە زل و بەڕێز و گەورەتر زانین لە خەڵکی و حەلاڵ کردنی زیادە بە شانە بۆ خۆ و شەیدایی ناو و ناوبانگ و پلە و پایەو ناسینی حکومەتداران و زۆر سیفاتی غەیرە مادی تری وەکو غرور و خۆ بە ماقوڵ زانین و فەقیر بە کەم زانین و دەوڵەمەند بە ڕێز سەیرکردن و دەسەلاتدار بە هەندوەرگرتن و حساب نەکردن بۆ توێژە لا خوارەوەکان و چینە کەم دەرامەتەکان و زۆر سیفەتی ناشرین و نا بە دڵی تر دەگرێتەوە.

سیفاتی ئیترافی بریتیە لە حەزکردن بە ماڵی دنیا و بەرق و زەرق و خۆش گوزەرانی و تەجەمولات و دیکۆراتی نا پێویستو زیادە و کۆشك و تەلار و ئەتەکیاتی ژیان و ڕواڵەتی دەوڵەمەند و خۆش گوزەرانە و زۆر سیفاتی تری مادی و غەریزەی بێ پردانگ و لە ڕێ دەرچوو و لادەر و عادەتی - پڕ لە ئیسراف و تەبزیر -.

کاك ئەحمەد لەگەڵ ئەوەدا کە لە خێزانێکی دەوڵەمەندا لە دایك و گەورە بووە بەلام ئەو ژیانە هەرگیز کاریگەری خراپی نەکردۆتە سەر و بە

پێچەوانەوە هەمیشە مەیلی هەژاران و نەداران و چین و توێژە کەم دەست و کەم دەسەڵات و ستەم لێکراو و موستەزعەفینی بووە [ مستضعف :- هەم لە ڕووی مادیەوە هەم لە ڕووی مەعنەویەوە زوڵم لێکراوە ] خۆی بە یارو یاوەر و هاوڕێی ئەو کەسانە زانیوە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بە پلە یەك حساب نەکراون، بە ڕاستی ئەمە یەکێکە لە سیفاتی بەرزی پێغەمبەران بە قسەی میلـەتی نـوح کـە هەمیشـە بـەلای -ارذلـون-دا کـەوتون و مـوترفین و موستەکبیرینی میلەتاکانیش هەمێشە دژیان بوون [ لێرەدا پێویستە ئەمە ڕون بکەمەوە کە هەموو دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارێکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی ناکەونە خانەی ئەو توێژەوە بەڵکو چۆنیەتی ژیان و بیر و بۆچون و ڕەفتاریان دیاری دەکات موتریف یا موستەکبیرن ].

فـەقیر پـەروەری و سـنگ فراوانـی و سـادە ژیـان و نـەبوونی هەسـتی بەرژەوەندخوازانەی تایبەتی و دڵسۆزی بۆ لێقەوماوان‌و بێوەژن و هەتیو و بێ سەرپەرشت و بێ خانە و لانە و ئاوارە و خەمی بۆ خەڵکی کەم دەست و خۆشەویستی و ڕێزی بۆ خەڵکی تازە کۆچکردوی لادێ بۆ شارە گەورەکان لە سیفاتی هەمیشەیی و بەردەوام و ڕۆژانەی کاك ئەحمەد بوو، هەمیشە لە خـەمی مەسـەلە گـەورەکانی کۆمـەڵگاهی بـوو وەکـو مەسـەلەی چینایـەتی و نەتەوایەتی و مەزهەبی کە کێشەی گەورە و لە مێژینە و بێ چارەسەر و دەسکاری نەکراوی کۆمەڵگای ئێران بووە. هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوو چۆن چارەسەر دەکرێت و لە چ ڕێگایەکەوە و بە چ شێوازێك، بەڵام بە داخەوە تا ئێستاش ئەو مەسەلانە هەر وەکو خۆی ماوەتەوەو چارەسەر نەکراوە و هەموو شێوازەکانی سیاسی و چەکداری و حکومەتی نەیان توانیوە کێشەکە چارەسەر بکەن.

کاك ئەحمەد هەر دوو سیفەتی ئیستیکبار و ئیتراف بە دوو ستوونی بنـەڕەتی خەسـاندن و تیـابردنی مـرۆڤ دەزانێـت و خـۆ ڕزگـار کـردن لـەم سیفەتانە بە کرۆکی پەروەردە -تزکیە- دەزانیت، خۆی پێشەنگی ئەم بۆچون و خویندنەوەیە بوو و نمونەیەکی کاراو ئاشکرای یەك مرۆڤی -مزکی- یان بە

وتەی کاك ئەحمەد خۆی -لێپرسراو- بوو، تا مردن بەردەوام لەسەر ئەم ڕێبازی پەروەردەیە بوو بە ئەندازەیەك گەشەی کردبوو کەمترین ڕەنگ و بۆنی خۆپەرستی -انانیەت- و بۆچون پەرستی و مەزهەب پەرستی و دین پەرستی تێدا بەدی نەدەکرا، دەمارگیری لە هیچ بوار و لایەنێکی فیکری و نەتەوایەتی و مەزهەبی و دینی و سیاسیدا بەر چاو نەدەکەوت، بەپێچەوانەی زۆربەی کەسایەتیە ناسراو و بەناوبانگەکان هەرگیز بایەخی بە خودی خۆی و ناو و ناوبانگ و پلە وپایە نەدەدا و کشانەوەی لە مەیدانی سیاسیدا لە سەرەتای سالی ١٩٨٠ گەورەترین بەڵگەیە بۆ ڕاستی ئەم قسەیە هەر چەندە ئەو کاتە ساڵێك بەسەر شۆڕشی ئێراندا -١٩٧٩- تێپەری نەکردبوو لە نا دڵسۆزی و دەمارگیری و حزب پەرستی و دەسەلات پەرستی زۆربەی لایەنە کاریگەرەکانی مەیدانی سیاسی ئەو ڕۆژەی ئێران حاڵی بوو بوو چاکترین هەڵوێستی بەوە زانی کەنارگیری بکات لە سیاسەت و لەو شەرە بێتە دەرەوە کە بەناوی خەلکەوە دەکرا بەلام لە ڕاستیدا شەری دەسەلات و پلە و پایە و زیادە بەشانە -امتیازات- و ناوبانگ بوو، لە پاش ئەمەش هەموو لایەك دژایەتیان دەکردو خەریکی ناوڕزاندنی بوون و ڕاگەیاندنێکی بێ ویژدان و ناهەق بەردەوام خەریك بوو بۆ خراپ نیشاندان و تاوانبارکردنی حکومەتی ئێران بە وەهابی و پیاوی سعودیە و ئێراق و ئەمریکایان ناو دەبرد و بە داخەوە ڕاگەیاندنی دەمارگیر و موراهیقانەی حیزبە کوردستانیەکانی خۆشمان لەم پرۆسەی نوخبە کوشتنەدا زۆر زەهراوی تر لەوان کاریان دەکرد و هەر چەندە ئەو وازی لە کاری سیاسی هێنابوو بەلام وەك تاوانبارو کورد و کوردستان فرۆش ناویان دەبرد لەهەمان کاتدا حکومەتی ئێران گرتی و ١٠ سال لە زیندانەکانی کۆمیتەی موشتەرەك و ئەڤین و قزل حەسار بێ ئەوەی هیچ کەس بزانێت لە کوێیە و تەنانەت کەس و کارو تەنیا کوڕەکەشی هیچ هەواڵێکیان لێی هەبێت { ئەم باسە دەکرێت بە تەنیا و ئەلاحەدە و دور و درێژ کاری لەسەر بکرێت } لێرەدا مەبەستمان ئەوە بوو کاك ئەحمەد ئەوەندە تەزکیەی نەفسی خۆی کردبوو کە شتێك بە ناوی خود و بەرژەوەندی لە وجودی ئەم مرۆڤەدا نەما

بوو، سەرانسەر ڕەحمەت بوو بۆ هەموو لایەك تەنانەت ئەو كەسانەی كە كاك ئەحمەدیان بە دوژمنی خۆیان دەزانی { چونكە كاك ئەحمەد كینە و نـەفرەت و دوژمنایەتی لەگەڵ كەس نەبوو خۆی بە لێپرسراو دەزانـی دەربـارەی هـەموو كەس و ڕەحمەتی هەمووانی دەگرتە بەر }.

كـاك ئەحمـــەد بـــەم بۆچونـــە دەربـــارەی مـــرۆڤ و بـــە م تێگەیشـــتن‌و خوێندنەوەیـە دەربـارەی دیـن سـەر ئـەنجام جیاوازیـەكی زۆری هـەبوو لەگـەڵ هەموو ئەو كەسانەدا، كە بە ناوی دڵسۆزی بۆ دین و مرۆڤ لە مەیداندا بوون.

لەگەڵ ئەم هەموو خاڵە ئـەرێنیانـە كە باسمان كـرد كـاك ئەحمـەد مـرۆڤ بوو، وەكو هەموو مرۆڤێكی تر ئەگەری هەڵە و خـەتا و كـەم و كـوری هـەبووە هـەرگیز هەڵـەكانی پـەردەپۆش و پینـە و پـەڕۆ نـەدەكرد، وەك كـاك ئـەحمـەد خـۆی دەڵێـت { هەڵـە و خـەتای فـراوانم كـردووە بـەڵام خـوا ئاگاداره هـەرگیز خیانـەتم لـە دیـن و خـەڵك و خـۆم نـەكردووە ئـەو هەڵانـەی كردوومـە لـە نەزانینەوە بووە و ئەو كاتە وام زانیوە دەبیت ئەو كارە بكەم بەڵام هەر كاتێك ڕاچڵەكیبم ئیتر پاكانـەم بـۆ هەڵـە و خـەتای خـۆم نـەكردووە } كـاك ئەحمـەد ئەوەندە مرۆڤ بـوو زۆربـە ئاسـانی دانـی بـە هەڵـەكانی خۆیـدا دەنـاو هـەرگیز بڕوبیانوو پاساوی نەدەهێنایەوە و هەڵەكانیشی نەدەخستە سەر شانی ئەم وئەو بۆ نمونـە یـەكێك لـەو هەڵـە گەورانـەی كـاك ئەحمـەد لـە ساڵەكانی 1964بـە دواوە بەردەوام دوبارەو سەدبارەی كردبـۆوە هەڵوێستی تونـدی بـوو بەرامبـەر سـەرانی تەكیـەو خانـەقا هەرچەنـد بـەو پـەڕی ویژدانـەوە ئـەهل و پـەیڕوانی تەكیـەو خانـەقا واتـە دەروێـش و شـێخەكانی تەریقـەتی قـادری و سـۆفی و شـێخەكانی تەریقـەتی نەقشـبەندی جیادەكاتـەوەو بەیـەك ئـاگر هـەمویان ناسـوتێنێت بـە واژەی[ شـێخگەلی دیـن فـرۆش و دنیـا پەرسـت لـە شـێخگەلی دینـدارو بە تەقوا ] جودایان دەكاتەوە لە یەكتری یان واژەی [سۆفیگەلی خوێن شیرین، براگەلی دەروێشی بە ئیخلاس] دەیەوێت بڵێت دەزانـم زۆربـەیان پـاكن و ڕێگای تەریقەت بە دین و دینداری دەزانن و بە نیـەتێكی پـاك و ئامـانجێكی موبارەكەوە ڕویان كردۆتە تەكیە و خانەقا بەڵام دیسان كاك ئەحمـەد لـە دوای

دەرچونی لە زیندان لە ناو كۆڕیكی فراوان و دەستە جەمعیدا دانی بەوەدانا كە هەڵەی كـردوە و جنێودان وتونـدوتیژی و شێوازی ناشـرین لـە بەرامبـەر هـیچ كەسـێكەوە دروسـت نیـە و لەگـەڵ دینـداری و موسـڵمانێتیدا ناگونجێـت و زۆر ئازایانە دانی بە هەڵەو خەتاو كەم و كوڕی خۆیدا نا،هەرچەندە ئەو هەڵوێستە تـا ئێسـتاش كاریگـەری خراپـی پێـوە دیـارە لـە پەیوەنـدی پـەیڕەوانی مەكتـەب قورئان و ئەهلی تەریقەتدا بە شێوەیەكی گشتی.

ڕاسـتە كـاك ئەحمـەد شـێوازی ئێسـتا و 50 سـاڵ لـە مەوبـەری شـێخەكانی تەریقەت بە شێوەیەكی گشتی (نەك هەموویان)بـە شـێوازێكی كاریگـەر نازانێـت بـۆ نزیـك كردنـەوەی خـەڵك لـە دیـن یـان ڕێنمـایی و هیدایـەتی خـەڵك لەبـەر ئەوەی خوێندنەوەو تێگەشتنێكی تر بۆ دین و پەیوەندی بـە ژیـان و مرۆڤـەوە دەكات هەرچەند لە سەرەتاو لاوێتیدا دژایەتی و ڕوبەڕوبونـەوە بـە بەشـێك لـە ڕێنمـایی و بانگـەوازی دینـی حسـابی دەكـات بـەڵام سـەرەنجام دەطاتـە ئـەو ڕاستیەی نە خۆی و نە هیچ كەسی تـر كـاری وا نەكەن و ئەو هەڵوێستە بە ئەركی دینداری نازانێت و دەتوانم بڵێم كاك ئەحمـەد گەشـتبوە ئـەو ڕاسـتیەی كە ڕێگاگـەل فـرەن و هـەر كەسـێك لـە هـەر ڕێگایەكەوە بتوانـێت پەیوەندیـە مەعنەوی و ئەخلاقیەكانی دەستە بەر بكات شتێكی بەسودە بـە مـەرجێك لـە ئەركان و هێڵە گشتیەكانی ئیسلامەتی دەرنەچێت.

هەرچەندە من كاتێك ئەم قسەیە دەكەم نزیكـەی 20 سـاڵ بـە سـەر كـۆچی دوایی كاك ئەحمەدا تێپەڕیوەو كاریگەری سەردەم و شوێن و پێشینەی فیكـری و ڕۆحـی و ئـەزمونی ئـەم چەنـد سـاڵە هۆكـارێكی گرنگـە لـە گەیشـتن بـەم مەسەلەیە، پلۆرالیسمی دینی باسێكی قوڵ و گرنگ و پێویستە چەند ئـەزمونی مەعنەوی و ڕۆحـی و ئـەخلاقی پێویسـتە ئەوەنـدەش بارگـەی زانسـتی دەوێـت كاك ئەحمەد بە پێی ئەو باسانەی دەربارەی هەق و باطڵ و ئیسلام و كوفرو ئیمان و تەفسیری ئایـەتی 62 سـورەی -بقـرە-و چەنـد بـاس ونوسـراوێكی تـر كردویەتی ئازادی فیكرو لێبوردەییو سینە فراوانـی و ڕەحمـەت و ڕەنفـەتی لـە لوتكەدا بو بەرامبەر ئەهلی كتاب و شیعەكان و فیرقەكانی تـر، ئـەم تێگەشـتنە

شاکارێکی گەورەی فیکری و ئەخلاقی کاك ئەحمەد بوو بەلام زۆر جێی سەرسوڕمانە کاتێك دەگات بە ئەهلی تەریقەت هەر چەند وەك وتمان هەموویان وەك یەك نابینیت بەلام دیسان زۆر توندو تیژ بوە و ئەم ناکۆکیە لە زۆر بڕگەی مێژودا و لەلایەن زۆر مرۆڤی بەرزو گەورەی ترەوە بەرچاو دەکەوێت، من خۆم بۆم حەل نابێت بەلام ئەرکی من ئەوەیە دوعایان بۆ بکەم و هەوڵ بدەم خۆم و هەر کەسێکی تر کە دەتوانم قەناعەتی پێ بکەم ئەو هەڵەیە نەکات،هەروەك چۆن کاك ئەحمەد ئەم دەرسەی داداین ونەیهێشت بە سەریا تێپەڕێت،بۆ ئەم بابەتە تەنیا دەڵێم خوا گەورەیە وبەشی هەمومان دەکات و لەجیاتی سەلماندنی هەقانیەتی خۆم باشتروایە خەریکی پەروەردە کردنی خۆمبم و بیر لە موسڵمانیتی و مرۆڤیتی زاتر و باشترو قوڵتر و ئەخلاقی تر بکەمەوە،مەسەلەی ناکۆکی بەشێکی ژیانە وهەر بوەو هەر دەبێت بەلام دەبێت ئیجابیانە بەکاریبهێنین بۆ خزمەتی مرۆڤو ژیان بە هەردولایەنی مادی و مەعنەویەوە.

مرۆڤ و ناسینی فیترەتی مرۆڤ خەمێکی گەورەی کاك ئەحمەد بوە و چونکە باوەڕی وا بوە هەموو شتێك لەم ناسینەوە دەست پێ ئەکات،ئەگەر ناسینەکە سەرپێی و سادەو ساکار بێت دوچاری هەڵە دەبین و تواناکانمان هەرس دەکەین لە بەر ئەم خاڵە گرنگە باش بە ناسینی مرۆڤدا ڕۆچوەو موتاڵەعەی باشی زانستی مرۆڤ ناسی کردوە چ لە زانایانی ولاتانی ئیسلامیدا چ لە ولاتانی ئەوروپاو ئەمریکاو شوێنەکانی تر، سەرەنجام دەطاتە ئەو قەناعەتەی مرۆڤ دەکرێت بەسێ بەشی سەرەکیەوە

1 - لەش-نەفس-غەریزەکان بە ڕێوەی دەبەن
2 - هۆش - ذهن- کە عەقڵ ناسراوترین کارەکتەرێتی
3 - دڵ - مەعنەویەت - کە ڕۆح مەعنەویەت ڕادەپەڕێنێت

هەر سێ لایەنەکە لای کاك ئەحمەد دەبێت حسابی بۆ بکریتو بزانیت مرۆڤێك یان شارێك یان کۆمەلگەیەك یان مرۆڤایەتی بە گشتی دەردیان چیە؟ لە چ لایەنێکەوە توشی لا ڕێ چون بوە؟

غریزەکانی؟

هۆش و لایەنی عەقڵی؟

مەعنەویەت و ڕۆحی؟

ئەگەر زانیت و توانیت نەخۆشی و دەردی مرۆڤ دیاری بکەیت بە ئاسانی دەتوانیت چارەسەری بکەیت، ئەمە تەنانەت لە نەخۆشی یە سادەکانی لەشی مرۆڤیشدا هەیە هەمان شێوەیە ئەگەر کەسێك ئازارێك لە هەناویدا هەبێت پێویستە سەرەتا پزیشکی پسپۆڕی هەناو ببینێت و هەوڵی دۆزینەوەی نەخۆشیەکە بدات نەك بیبەیت بۆ لای دکتۆرێکی تر دوای دیاریکردنی نەخۆشیەکە چارەسەر دەست پێدەکات.

ئایا مرۆڤ دەگرێت بە ئەندازەی نەخۆشێك بایەخی پێ نەدرێت و هەوڵ بۆ ناسینی تەواوی نەدرێت؟

هەر کەسێك بە مەعلومات و ناسینیکی کەمەوە ناتوانێت بڕیار بدات مرۆڤ ئەمەیەو ئەمەش دەردەکەیەتی و چارەسەریشی ئەمەیە و خەڵك بە بێ بیرکردنەوە دەست بکەن بە پیادەکردنی؟

دەشێت ئینحرافی مرۆڤ لەلایەنێکەوە بێت یان دو لایەن یا هەر سێ لایەن یان هەر لایەنێك یان دو لایەن یان بەشێکی لە لایەنێك هەر ئەمەیە کاری بانگەوازکاری ئیسلامی سەخترو وروژێنەرتر دەکات [ دیارە هەر کەسێك ناتوانێت خۆی بە بانگەوازکاری ئیسلامی بزانێت و زانینی زانستی حەدیس و شەرع و عەرەبی وتەفسیر بەس نیە بۆ ئەم کارە و بە کورتی دەعوەتکار لەلایەن خواوە دیاری دەکرێت، یان بەو پێودانگە ئەخلاقی یەی کە قورئان دیاری دەکات -ۆ ی- ئەنفال٢٤] دەیناسینەوە.

هیدایەتی ئاشکراو نا ئاشکرا - ظاهری وباطنی- ڕواڵەتی و دەرونی لای کاك ئەحمەد پێگەیەکی زۆر گەورەی هەیە و دەتوانێت ئەرزش و بایەخی هیدایەتی دەرونی — باطنی — کە بەدەست مرۆڤ نیە بەهەند وەربگیرێت و هەر ئەمە خۆی هەلێکی باشە بۆ ئەو کەسانەی خۆیان بە ڕزگارکەری مرۆڤ -منجی- دەزانن تۆزێك لە باو بڕۆ ئیدعای قەبەی خۆیان کەم بکەنەوە و بەشی گەورە

بۆ خوا دابنێن و وا نەزانن كە ئەوان لە خوا هادی تر و دڵسۆزترن، بەداخەوە ئەمرۆ لە ناو جوڵانەوەی نوێی ئیسلامیدا كە زۆرتر سیاسیە تا ئیمانی و ئەخلاقی زۆر سادە حسابی بۆ دەكرێت و هەندێكیان ئەوەندە فریودراو و چەواشەكراو و بەبەندكراوی شەیتان و نەفسن كە هەر كەس وەك ئەوان بیرنەكاتەوە لە فیرقەی ئەوان نەبێت لە زومرەی ڕزگاركراوەندا -فرقە ناجیە- حسابی بۆ ناكەن و ئەم كەسانە نەزانانە یا خوانە خواستە زانایانە خۆیان لێ بۆتە خوا چونكە تەنیا خوایە و پەیڕەوی كردنی خوایە ئەم سنورە دیاری دەكات، هەر لەبەر ئەمەیە كاك ئەحمەد پشكی هیدایەتی باطنی زۆر بەفراوان دەبینێت.

خاڵێكی تر زۆر گرنگە ئەویش هۆكاری ئازادی -اختیار- كە وا دەكات دەریچەی ئینحرافەكانی زۆرتربن و دواجار هیدایەتی قورس تر و زەحمەت تر و كاك ئەحمەد لە مرۆڤ ناسی خۆیدا زۆر بەڕونی باسی دەروونی هۆشیاری و ناهۆشیاری مرۆڤ دەكات و ئەو شپرزیانەی لە دەرونی هۆشیاریدا یە ناسینی ئاسانە و چارەسەری ئاسان بەڵام ئەوانەی سەر بە دەرونی ناهۆشیارن ناسینیان زەحمەت و كۆششێكی زۆری دەویت تا بناسرێن و سەر ئەنجام چارەسەریان زەحمەتە و كاری هەموو كەس نیە مەگەر كەسێك كە قورئان سیفەتی -ناصح و امین-ی بۆ بەكاردەهێنیت. دوای ناسینی گشتی مرۆڤ كاك ئەحمەد بەو پێشینە فیكریە دینییەی كە بویەتی -تزكیە- بە باشترین پرۆسە دەزانێت بۆ پێگەیشتن و كامڵ بونی مرۆڤ و -تزكیە- لای كاك ئەحمەد پرۆسەیەكی هەنگاو بە هەنگاو و پلەپلەیە و كات و تاقەت و ویستێكی زۆری دەوێت و نە هەموو مەۆڤەكان دەتوانن بە تێروپڕی و تەواوی ئەنجامی بدەن ونە هەموشیان وەكو یەك ئەنجام وەردەگرن چونكە -خود-ی مرۆڤ بەو پێكهاتە پڕ راز و نهێنیەی كە باسمان كرد هەوێنی بابەتەكەیە بە دەرونی هۆشیار و ناهۆشیار و هەر سێ لایەنی نەفس و هۆش و دڵ و هەموو بوار و لایەن و هۆكارە ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆكانی سەردەم و شوێن و پەروەردەی خێزان و عورف و عادەت و پەیوەندی كۆمەڵایەتی و فەرهەنگ و حكومەت

لـە سـەرەتای ئـەم پرۆسـەیەدا ناسـینی ڕاسـتەقینەی هـەق و هەقیقـەت گرنگترین بابەتە و قبوڵ كردنی هەقیش نیشانەی سەلامەتی و زەمینـەی لـە پێشەوە ڕەخساوی فیترەتە و پێچەوانەكەشی هەر بەهەمان شێوەیە، لەبەر ئـەم هۆكارە گرنگە هەركەسێك لەگەڵ كەسێكی تـردا فـەرقی هەیـە و هەریەكە بـە جۆرێك ئەنجامگیری دەكات ڕێژەی پەسەندكردن جۆراوجۆرەو سەرئەنجام هـەر كەسێك بە توانای خودی خۆی هەنگاو هەڵدەگرێت و یەك دینمان هەیە بـەلاّم ملیۆنەها جۆر و ڕێژەی ئیمان و دینـداری هەیـە، خـوا یاسای دانـاوە هەركـەس خۆی بێت واتە -اختیار-، هەر لەم بابەتە سود وەردەگرم بۆ مەسەلەی ڕێژە و ڕادە و جـۆری دینـداری و ئیمانـداری دەمـەوێت بڵێم كـەس ناتوانێت قاڵبێـك دیاری بكات و ئەوەی لەم قاڵبـەدا جێی نـە بۆوە كافر و موشـریك و بێ دیـن بێـت، دیـن داوا لـە مـرۆڤ دەكـات لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ خـودادا مومـارەسـەی مەعنەویو ئیمان و دینداری بكات بـە پێـی توانـای خـۆی هـەر ئـەنجامێكی بە دەست هێنا بەشی خۆیەتی و هیچ كەس ناتوانێت لەسەر زەوی هەقی خوایەتی بۆ خـۆی دابنێـت یـان بـۆ كەسێكی تـر كە خۆشـی لـە پاڵیـدا نیمچە خوایەك بێت(واتـە: لـة حـوكم دان و ديـاريكردني ضارةنوسـدا). لـە پرۆسـەی تەزكیـەدا وەلاّمی پرسیارە جدیەكان دەدرێتەوە، بونەوەر -وجود- بە گشتی و مـرۆڤ بـە تایبەتی جدیترین پرسیارن و هەر كەسێك بەپێی وەلاّمدانەوەی بەم پرسیارانە ڕادەی مرۆڤانـەی مـرۆڤ و باشـبون و كامـڵ بـوون و بـە سـودبوونو هـەروەها ڕادەی خراپبون و نا مرۆڤ بوون و زەرەردار بونی خۆی دیاری دەكات لە پلەی جۆراوجـۆردا، وەلاّمـی جـدیتر و قـوڵتر و باشـتر و هـەقانیتر و ئاقلاّنـە تـر ئـەنجامی باشـتر دەدات بـە پرۆسـەی -تزكیـە- لــە پلــەی جۆراوجـۆردا و پێچەوانەكەشـی بەهـەمان شـێوە تـا سەرپێی تـر و بـێ بایـەختر و خراپتـر و ناهەقانە تر وەلاّم بداتەوە ئەنجامی خراپتر دەدات بەدەستەوە سـەرئەنجام لـە -تزكیـە- كـە تـەنیا لـە دەسـت دینـەكان و پـرۆژە مەعنەویـە ڕاسـتەقینە و هەقـەكان دێـت مرۆڤـی بـاش و بـە سـود و فیـداكار و دڵسۆز دێتـە كایـەوە

پێچەوانەکەشی دەبێتە دوکەڵ و چاوی هەموان دەهێنێتە ژان و مرۆڤایەتی گرفتار دەبێت بە دەستیەوە.

-تزکیە- پرۆسەی تەکامولی مرۆڤە نەك زانست زیادکردن زۆر کەس زۆر زانایە تەنانەت لە زانستە دینیەکاندا بەڵام موزەکی نیە و زۆر کەس هەن کە هیچ زانیاریەکیان نیە یان زۆر کەمە بەڵام موزەکین خۆ ئەگەر ئەهلی زانست و زانیاری بێت و موزەکیش بێت چاکترە.

تزکیە لەلای کاك ئەحمەد دوای ناسینی مرۆڤ و هەقیقەت کارکردنە لەسەر هەر دوو سیفەتی – استکبار و اتراف – بە ئیخلاسەوە کە بێ شك مرۆڤ بە واتای ڕاستەقینەی مرۆڤ دێنێتە کایەوە تا ئێستا ئاماژەیەکم کردووە بە هەر دوو ناميلکەو باسی – فیطرەت و هیدایەت – و – تزکیە و تعلیم—و ئێستا هەروا ئاماژەئاسا دەربارەی دڵی ساز و ناساز دەدوێین کاتێك باسی – دڵ – دەکەین واتە باسی مرۆڤ دەکەین مرۆڤ هەروەکو چۆن بەپێی فیطرەت لە کاتی تینوبوندا ئاو دەخواتەوە و خەواڵو بوو دەخەوێت و برسی بوو خواردن دەخوات هەر بە پێی فیطرەت و ئەزموونی مرۆڤ لە مێژوودا و هاوکاری و ڕێنمایی دین فێردەبێت ئاوی پاك بخواتەوە و لە دەفری پاکدا هەڵیبگرێت و لە جێگای نەرم و خاوێندا بخەویتو خواردنی پاك بخوات ئەم سیفەتانە لەگەڵ دڵێکی ناسازدا ناکۆکن و لەگەل دڵێکی سازدا کۆکن.

مرۆڤ ئەقڵی بەکار دەهێنێت رۆژ و شەو و هەفتە و وەرزەکان لە یەك جیادەکاتەوە ڕۆژ ڕوناکە و شەو تاریکە و هەفتە و حەوت و ڕۆژە و بەهار سەوز و باراناوی و جوانە و پاییز بنەمای نوێبونەوەی مرۆڤ و سروشتە و زستان ساردە و هاوین گەرمە و کچ و کوڕ و پیر وگەنج لە یەك جیادەکاتەوە و بۆ ئەوەی زاد و وەلەد هەبێت دەبێت کچ و کور خێزان پێکبهێنن و منداڵیان ببێت و بە جوانی و ڕێك و پێك ئەم منداڵە گەورە و پەروەردە بکەن ئەرکی سەر شانی جێ بەجێ بکات تا دەگاتە ئەو خاڵە بنەڕەتییەی خوا هەیە و خالقی بوون و مرۆڤ و سیستەمی سروشتی و جبری یە و مرۆڤی کردووە بەجێنشین و بەڕێوەبەری کاری سەر زەوی بەو شێوە ڕێك و پێکەی کە

بونەوەر و خودی مرۆڤی دروست كردووە هەموو ئەمانە كە تاووتویی ئەقڵە لەگەڵ دڵێكی سازدا كۆكە و لەگەڵ دڵێكی ناسازدا ناكۆك.

مرۆڤ دەبێت بە سۆز و میهرەبان بێت و هەموو شتێكی خۆش بوێت و تواناكانی بۆ هاوكاری و خزمەتی هاو جۆرەكانی بەكار بهێنێت بەخشەندە و سەخی و ئارام و بە تاقەت و لێبوردە بێت. هەق و هقوقی دایك و باوك و خوشك و برا و ژن و منداڵ و هەموو ئەو مرۆڤانەی لە نزیك یا دوور پەیوەستن پێوەی بە ڕێك و پێكی دابین بكات و بە سود بێت و لە خزمەتی داواكاریەكانی خەڵكادا بێت و بە چاوی ڕەحمەت و لێبوردنەوە بڕوانێتە كاروانی مرۆڤایەتی لە ڕابردوودا و لە كەمو كوڕی و خراپەكانیان سود وەربگرێت بۆ سەردەمەكەی خۆی، ئاهو هەناسە و تاسە و دوعای خێری هەبێت بۆ ئاییندەو لەلای خۆیەوە سەردەم پەرستی و شوێن پەرستی - زمان و مكان - بە كۆتا بهێنێت و ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو بخاتە خانەی خۆشەویستیەوە و نیاز و تەمەنای دنیایەكی بێ دەمارگیری { لە هەموو جۆرەكانی } بكات بۆ ژیانو مرۆڤ، هەموو ئەم سیفەتانە لەگەڵ دڵێكی سازدا كۆكنو لەگەڵ دڵێكی ناسازدا ناكۆك.

كات و ئەحواڵی فیكری و ڕۆحی و پەیوەندیەكانی مرۆڤ كاریگەرن لەسەر ئەم سیفەتانە و ئەگەر منداڵێك كەوتە خەتەرەوە دیندارێك ڕانەچڵەكاو هەوڵی نەدا ئەو منداڵە ڕزگار بكات و كەسێكی بێ بایەخ بەرامبەر بە دین یان بێ دین {هەموو بێ دینێك كافر نیە} ڕاچڵەكی و خۆی خستە خەتەرەوە بۆ ئەوەی ئەو منداڵە ڕزگار بكات لەم كاتەدا ئەو دیندارە خاوەنی دڵێكی ناسازە و ئەو بێ دینە خاوەنی دڵێكی سازە، بەڵام ئەمە هەمیشەیی نیە و بە كورتی پەرۆشی بۆ شتە باشەكان و جوانەكان و دڵسۆزیكردن و چاكی بابەتی دڵی سازن و پێچەوانەكەشی دڵی ناساز، مرۆڤ ناسی و هەقپەرستی و تەزكیە بۆ ئەومیە دڵەكان ڕۆژ بە ڕۆژ ساز و سازتر بكات، ئەگەر پێچەوانەكەیت بینی كاریگەری خوێندنەوە و تێگەیشتنی ئەو كەسەیە لە دین نەك خودی دین و خودا، بۆ نمونە حاڵەتی خۆ بە هەق زانین و هجومی قسەكردن و توند و

تیژیو پر ئیدعایی و ئەهلی جەدەل و شەڕە قسە و چەلەحانێ و خەڵك بە كافردانان و بە ئاسانی شەركردن بە ناوی جیهادەوە سیفەتێكی دیار و ئاشكرای ئیسلامی هاوچەرخە بە سیاسی و نا سیاسیەوە ئەگەر چی بە ناوی -دعوە-ی ئیسلامیەوە دەكرێتو ڕەنگە كەسانێكی زۆریش لەم جولآنەوانە بە ئیسلامەتی بزانن و بە ڕاستی و پاكی دەیانەوێت خزمەتی دین بكەن بەڵام هەموو ئەو حاڵەت و سیفەتانە سیفەتی دڵێكی ناسازن و هەرگیز مرۆڤێكی خواناس و دینداری ڕاستەقینە و زانا بە دین و خاوەن خودی خۆ و دڵسۆز بۆ مرۆڤایەتی و ژیان و موزەكی تا سەر لەگەڵ ئەو سیفەتانەدا هەڵناكات ڕۆژێك دێت ڕاچەنێت و بگاتە ئەو ئەنجامەی كە ئەم سیفەت و كردەوانە لە بەرژەوەندی خۆی و خەڵك و دیندا نیە و پێچەوانەی تەزكیە و دینداریە، وردە وردە هەوڵ دەدات سازگاری خۆی بە دەست بێنیتەوە و ناسازیەكانی كەم و كەمتر بكاتەوە، داكۆكی كردن لە كەرامەت و شەرەف و خاك و میللەت و دین و مەزهەب و تەریقەت و تایەفە و خێڵ و چینە ستەم لێكراوەكان بەو مەرجەی هیچ ڕێگایەك نەما بێت و تەنیا ڕێگا شەر و داكۆكی كردن بێت هەر چەندە ناسازە بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانج و كورتكردنەوەی دەستی ستەم و زوڵم و بە شێوەیەكی كاتی دەبێت بە سیفەتی دڵێكی ساز و ناسازی لێرەدا زوڵم و سوكایەتی و كۆیلایەتی و ستەم قبولكردنە هەر چەندە شەركردن چاری ناچاریە و تەنیا ڕێگە نیە بۆ داكۆكی كردن.

ئەگەر مرۆڤی دیندار لە پرۆسەی مرۆڤناسی و تەزكیەدا ئەنجامی باشی بە دەست هێنا و بوو بە خاوەنی دڵێكی ساز و لەبار و سەلامەت زەمینەی چۆن و لە كوێوە دەست پێكردن لەبار دەبێت بۆی، چونكە ئەم ئیمان و تەزكیە و سەلامەتیە دەیگەێنێتە ئیمانی زیاتر و ڕۆشنای زۆرتر، هێندە سەلامەت و دڵ پڕ مەحەبەت دەبێت نیازمەند و موخلیسی زانایانی ڕابردوی دین و فیكر و بۆچونی سالم و سەلامەتی هەموو كەسێك دەبێت هەر چەند دین و میللەت و زمان و وڵاتی ئەم زۆر لەوان جیاواز تر و دورتر بێت، هەمیشە ئەوان بە خۆی و خۆی بەوان دەزانێت سوود لە هەموو شتەكانیان وەردەگرێت وێرای ئەمەش

سیفەتی ئەم مرۆڤە موزەکی و پێگەیشتوو ڕۆشنانە ئەوەیە کە هیچ یەك لەم کەسانە و بیر و خوێندنەوەیان بە هەقیقەت و دینی کامڵ نازانێت و تەنیا وەکو نمێك لە دەریای هەقیقەتی خوا سەیریان دەکات و بە خوا و پێغەمبەرەکەی حسابیان ناکات، دەربارەی هەقیقەت ناسی پێغەمبەران لە هەمووان جدیتر و عەمەلی تر و قوڵتر بانگی لاالەالاهو هەڵدەدەن و ئاشکرایە لە مەیدانی خوا پەرستی دا جێگە بۆ کەس ناهێڵنەوە جگە لە خوا.

مەرج نیە ئەم کەسە ڕۆشنانە ئیدعای پێشەوایەتی و ئیجتیهاد بکەن {جگە لەوانە لێپرسراون و فەرمانیان پێ دەدرێت} بەڵام شوێن کەوتویی -تقلید- و ئیتاعەیان ڕۆژ بە ڕۆژ کەم و کەمتر دەبێت [ئەمە بۆ مەزهەبی فیقهی ڕێگەی پێنادرێت لەبەر ئەوەی موسڵمانان تەفەروقی زۆرتریان نەبێت هەر کەس لە سەر مەزهەبی خۆی بمێنێتەوە یان ئەگەر مەزهەبیش بگۆڕێت بچێتە سەر مەزهەبێکی ناسراو نەك مەزهەبێکی تازەدروستبکات] خۆیان لە دیدگایەکی ترەوە ئەم وجودە دەبینین و دنیا بینیەکی تایبەتیان بۆ دێتە کایەوە کە بۆ خۆیان ئەرك و لێپرسراویە و بەرئەنجامەکەشی سەلامەتیو خۆشەویستی و ئارامی و ئومێد و دڵنیایی و ڕەزایەتە.

کەسایەتی و بۆچون و خوێندنەوەی کاك ئەحمەد بۆ دین دوا بۆچون و خوێندنەوە نیە، پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕێکی قورئان و بە پێی سەردەم و شوێنی خۆی ڕۆشنگەری زیاتری کردوە و زانایانی موسڵمان بە هەمان شێوە ڕۆشنگەری زیاتریان کردوە کە هەموو ڕۆشنگەریەکان کاریگەری سەردەم و شوێن و پێشینەی فیکری و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی و زمانی و فەرهەنگی کۆمەڵگەی تایبەتی ئەو کەسانەی پێوەیە، وەحی کاتێك دادەبەزێتە سەر ئەو سەردەم و شوێنە تایبەتە و بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و میلەتەکەیەتی، قورئانی لێ دێتە کایەوە و وەحی ناوی دەبیتە قورئان هەر وەك چۆن -وەحی- لەسەر دەم و شوێنی تردا ناوی دەبێتە ئینجیل یا تەورات یا کتێبەکانی تر،قورئان لە سەر دەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەم و میللەتی ئەودا ڕۆشنگەری زیاتر دەکات و سونەتەکانی پیغەمبەر (ﷺ) دێنە ئاراوە کە دوای دوو سەدە لەسەر دەستی

زانایانی موسڵمان زانستی -حدیث- بە نوسراوەی فەرمی و ناسراوەوە دەگەوێتە ناو کەلەپوری دینی ئیسلامەوە و زانایان بەردەوام قسە و ئیجتهادیان کردوە و بە هەزاران زاناو موجتەهید و موفتی ناسراو و بەناوبانگ لە مێژوی ئەم 400ساڵەدا تۆمارکراوە و لە هەر سەردەم و شوێنێکدا تەنانەت لە یەك سەردەم و شوێندا چەندین زاناو موجتەهید ڕاڤە و تاوتوێی مەسەلە دینییەکانیان کردوە و کەس بە هەقی خۆی نەزانیوە خۆی بە دوا کەس و ڕاڤە کار بزانێت مەگەر دانەدانەیەك کە ئەویش شازە و حسابی لە سەر ناکرێت، کاك ئەحمەد وەك موفەکیرێکی دینیی موڵکی هەموو دنیای ئیسلامە و کاتی ئەوە هاتوە بۆ چونەکانی بە زمانی تر بڵاو بکرێتەوە و ڕاڤە و تۆژینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت. توێژینەوە و وردەکاری زۆرتری تێدا بکریت و ئەو شتانەی باسی نەکردوە باسی بکرێنو ئەو شتانەی تەواوی نەکردون تەواو بکرێن و ئەگەرشتێکی نوێ و بۆ چونێکی نوێ هەیە بەیانی بکەن. دنیاو ژیان و پەیوندیەکانی هەمیشە لە گۆڕاندایە زۆر شت هەیە ئەگەر کاك ئەحمەد لە ژیاندا بوایە دەربارەیان قسەی دەکرد ئەگەر چی پێچەوانەی بۆ چونێکی خۆشی بوایە چونکە ئەو خواپەرستێکی موزەکی بو نەك بۆچونپەرستێکی وشك و دەمارگیر و خۆپەرست کە تەنیا قسە و بۆچونی خۆی بە هەق بزانێت و بۆچونە دینییەکانی تر بە ناهەق [ بۆچونی دینی واتە خوێندنەوەو تێگەشتنی کەسێك لە دین نەك خودی دین واتە خوێندنەوەو تیگەشتنی دینی زۆرمان هەیە بەلام دین هەر یەك دانەیە.]

یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی کە ئەمرۆ زیاتر لە هەر کاتێك پێویستی بە باسکردن هەیە قسەکردنە لەسەر بابەتە هاوبەشەکان و لێکچوو نیوە لێکچوەکان و ئەو مەسەلانەی ناکۆکیان لە سەرە نەوروژێنرێت بۆ ئەوەی ساردو سڕی و دووری لێکترازان و دو بەرەکی و چەند بەرەکی پەرەنەسێنیت، هەوڵ بدەین قسە لە سەر بابەتە هاوبەشەکان بکەین وەکو خواو زەرورەتی خواپەرستی و دینداری بۆ بەرێوەبردنی پرۆژەی مەعنەوی ژیان و بایەخ دان بەلایەنی ڕۆحی و ئەخلاقیو دنیای نادیار و ژیانی تر.

ئێستاش کە دێمە سەر ئاماژەو رونکردنەوەی ئامیلکەی چوارەم واتە چۆن و لە کوێوە دەست پێ بکەین؟

بە گشتی ئاماژەمداوە بـە زۆر بابـەتی ئـەم چاوپێکەوتنـە و ئـەوەی گرنگـە بیڵێم ئەوەیـە ئەگـەر مرۆڤ بـە شـیوەیەکی رێـك و پێـك خـود ناسـی کـرد و بایـەخی دا بـە تەزکیـەی نەفسـی خـۆی و رێبـازی پـەروەردە و گەشـانەوەو کامڵبونی گرتە بەر و بەردەوام بوو لە سەری سەرئەنجام دەگاتە بیرو بۆ چون و دیدگایـەکی سـازگار و دەبێتـە مـەخلوقێکی سـەلیم و سـەلامەت ئـەم مرۆڤـە ئیدی پێویستی بەوە نیە کارو فرمانی بۆ دیاری بکرێت بـەڵکو خـۆی لـە بـەر رۆشنایی ئیمان و سەلامەتی خۆیدا دەزانێت دەبێت چی بکات لەبەر ئـەوەی لـە جیگەیەکی باشەوە دەستی پێ کردوەو بـە شـێوەیەکی ریکو پیـك کاری کـردوە قۆنـاغی یەکـەم خـودی خـۆی و پاشـان ئـەرك و فرمانـەکانی. پرۆسـەی ژیـانی مرۆڤایەتی قۆناغ لە دوای قۆناغ پێویستە کامڵتر بێت و هەموو کەسێك بەشی خـۆی بـە جـوانی جێبـەجێ بکـات هـەموو ئـەو هەوڵانـەی کینـەو نـەفرەت و دوبەرەکی و چەند بەرەکی پەرەپێ دەدات نا سازگارە لەگـەڵ رەوتـی کامڵبونی ژیـانی خـەڵکی سـەر زەوی و ئـەرکی سەرشـانمانە رۆژ لـە دوای رۆژ یـەکبوونی زیاترو یەکێتی و بە بەیەکەوەبوونی زیاتر بدەین بە گوێچکەی مرۆڤایەتیـدا و داکۆکی لە خاڵە هاوبەشەکان بکەین و بەرەو ئەو - ئومەتە واحیدەیە - بچین کە قورئان و پەیامی پیـاوانی گـەورە باسیان لـێ کـردووە دەزانـم ئـەم ئامانجـە ماندووبوون و لێبران و لێبوردەیی زۆری پێویستە بەڵام کارێکی ئەستەم نیە و ئەگـەر بەنـدەی خـوا بـین نـەك هـەو او هـەوەس و لـە هـەوڵی پاشـەرۆژێکی رووناکـدا بـین نـەك هەڵپەهـەڵپی ئـەم دنیایـە و خۆمـان بکەینـە قوربـانی و فیـداکاری خـەڵك نـەك خـەڵك بکەینـە فیـدای خۆمـان و بەرژەوەندیـەکانمان، کارێکی ئاسانە وەك کاك ئەحمەد دەڵێت

یەکەم بەنـدەی هەوای یاخوا؟ دووەم دڵ
لـە هەوڵـی پاشـەرۆژە یا هەڵەی گڵ؟
سێیەم عالەم فیدات یا تۆ فیـدای خەڵك؟

بەمـانـەن ژینی بایەخـدار و بێ کەڵك

وەڵامـی ئـەم سێ پرسـیارە جدیـە ڕەوتـی بیـر و ژیـانی مـرۆڤ دەگۆڕێت و ئەرك و فرمانی سەنگین و شیرین دەكات.

ئامانج سەعادەتی مرۆڤە و دینداری بە پێی زەمان و مـەكان گۆڕانكـاری لـە خۆیدا دەكات بە ئەندازەیەك كە وەڵامی داخوازیـەكان بداتـەوە، ئـەركی مرۆڤـی موسڵمان دڵسۆزی كردنە بە بیر و قسە و ڕەفتار ئەگەر چی خـەڵك لـە بیـر و باوەڕدا بێ باوەڕترین و لە كردەوەدا خراپتـرین بـن دەبێـت ڕەچاوی كۆمەڵگـە بكرێت و بزانێت كۆمەڵگە جاهیلە؟

یان جاهیلی و ئیسلامیە؟

یا ئیسلامیە؟

بە پێی بەرئەنجامی ئەو هەڵسەنگاندنە شێوازی كاركردن دەگۆڕێت و لەهەر شوێنێك بەو شێوەیە دەبێت كە پێویستە و ڕەنگە زۆر جار لەیەك سەردەمدا و لە دوو شوێندا دوو بۆچونو شێوازی جیا لە یەك بگرێتە بەر.

ئەگـەر لـەم سـەردەمەدا حزبایـەتی كـردن و هەوڵـدان بـۆ گرتنـە دەسـتی دەسـەڵات بـە شـێوازێكی بـاش دەزانـن و لـەم ڕێگەیـەوە خزمـەت بـە ژیـانی كۆمەڵگەكەیان دەكەن دەبێت باش بزانن لایەنی سلبی فـرە و فراوانی هەیـە و ئاشكراترینیان دروست كردنی زیادە بەشانەیە - امتیازات - بۆ كەمینەیەك كە سـەركردایەتی دەكـەن و ئەوانـەی بـە هـەر هۆیـەك لێیـان نـزیكن و بێبـەری و بێبەش بوونی تەنانەت زۆرینەی پەیڕەوانی حزبەكەش زۆرینـەی خـەڵك وەكو ڕەعیەت سەیر دەكرێن و هەروەها زۆر ئافەتی خراپی تری حزبایەتی.

بەڵام دیسان ئیجتهاد لە كردەوە و ڕێبـازدا ئـازادە و كـەس ناتوانێـت هـەموو لایـەك ملكـەچی ڕێبازەكـەی خـۆی بكـات كۆمەڵگـە بكـات بـە دوو بەشـەوە بەشێكیان ڕزگـار و ئـازاد و بەشـێكیان گـومراو بـێ دیـن، لەبـەر ئـەوەی كـەم و كوڕی زۆرە دەربارەی باش ناسیني سیرە و سونەتی پێغەمبـەر (ﷺ) زۆر جار دەكەوینـە هەڵـەوە بـۆ نمونـە چـەك هـەڵگرتن بـۆ داكـۆكی ڕەوایـە بـەڵام بـۆ شەركردنو بە زۆر خۆسەپاندن دروست نیە، هەروەها ملكـەچی و گوێڕایـەڵی -

سمع و طاعە- تەنیا بۆ خودایە و بە نیسبەت پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا ئەو جێیە دروستە کە پەیوەندی بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەیە بۆ نمونە ئەرکان و جۆنیەتی نوێژکردن.

بە پێی زۆرینەی ئەزمونەکان سیاسەت و کاری سیاسی سەرئەنجامەکەی دەگاتە تاغوت سازی و مل هوڕی و خۆ سەپاندان چ لە ڕووی سیاسیەوە چ لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەبەر ئەم خاڵەیە کاك ئەحمەد پەروەردەکردنی مرۆڤی هۆشیارو خاوەن شەخسیەت و ئازاد و ئیماندار و موزەکی لە کۆمەڵدا بە پێویست دەزانێت چونکە ئەگەر خەڵك خاوەنی بیری ئازاد و کەسایەتی ئازادی خۆیان بن بە ئاسانی تەسلیم نابن و سیاسەتکاران و سەرانی حکومەت هەروا بە ئاسانی نابنە تاغوت و زاڵم و دیکتاتۆر تا خەڵك گوێڕایەڵیان زیاتر بێت و دوای قسەی ئەم حیزب و ئەو حیزب بکەون و بەرژەوەندی بەرزی مرۆیی خۆیان و ژیان و گوزەران و بەرژەوەندی باڵای خەڵك ڕەچلو نەکەن زوڵم و ستەم و دیکتاتۆری و حکومەتی تاغوتی زیاتر بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە لای کاك ئەحمەد مرۆڤی موسڵمان واتە مرۆڤی لێپرسراو - مسئول - هۆشیار و خاوەن کەسایەتی ئازاد و سەربەخۆ و مرۆڤ پەروەردە و هەق پەروەر.

لای کاك ئەحمەد -ئیمان- بنەمای خۆشبەختی تاك و کۆمەڵە و بەرهەمی ئیمان خۆشەویستی هەژاران و ستەم لێکراوانە و نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرای ناسینەوەی ئیمانداره لە بێ ئیمان.

مەسەلەیەکی گرنگ لای کاك ئەحمەد کە جێگە و باسی تایبەتی خۆی دەوێت سۆز و بەزەیی و دلسۆزی کردنە بۆ هەموو کەس دەتوانین بڵێین ڕێبازی کاك ئەحمەد ڕێبازێکی ئیمانگەرا و ڕەحمەتگەرایە بۆ ئەم سەردەمە کە توند و تیژی و نەفرەت گەرایی و بێ ئیمانی لە مەیداندایە بۆچونێکی پێویستەو ئەرکی هەموو لایەکە داکۆکی لێبکرێت و بە خەڵك ئاشنا بکرێت. - ڕەحمەتگەرایی- کاك ئەحمەد لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا بە لوتکەی کەماڵ دەگات و خۆی دەگەێنێتە ڕیزی پیاوانی گەورە و سینە فراوان و لێبوردە و

بەســۆزی وەکـو ســعدی و ابــن عربــی و مــەولانای ڕۆمــی و عــین القضــاتی هەمــەدانیو شـێخی ئیشـراق و حـەلاج کـە دیـدگای ئـەم کەڵـە ئیماندارانـە بـە شێوەیەکی گشتی هێندە ڕەحمەتگەرا بووە کە ئامادە نەبوون بە هیچ شیوەیەك مۆری کوفر و شرك و دۆزەخی بوون بدەن لـە ناوچـەوانی هیـچ کـەس و ئـەو مەلەفەیـان بـە جۆرێـك هەستیارکردووە کە هیـچ کـەس بـە ئاسـانی نـەتوانیت قسـەی تێـدا بکـات لەبـەر ئـەوەی ئـەم مـۆر لێدانـەیان بـە تـەواوی بـە سنوری دەسەڵات و ویستی خوا زانیوە، مرۆڤی لێپرسراو تەنیا لە هیدایەتی ڕواڵـەتی - ظاهری - مرۆڤەکاندا دەتوانێت دەور و کاریگەری هەبێت هیدایەتی دەروونی - باطنی - لە لای خوا خۆیەتی و باشتر وایـە مـرۆڤ ئەوەنـدی سـەر گەرمـە بـە عـەیب و عـار و کـەم و کـوڕی خەڵکـەوە نیـو ئەوەنـدە خـەریکی خـۆی بێـت و وەسیلەی خێر و سەعادەت بێت بۆ خەڵك، دادگای مرۆڤەکانیش بـە جێبهێڵـین بۆ پەروەردگار کە مالیك و حاکمی رەهای دنیا و قیامەت هەر ئەوە.

کامەران حەمە حەمەسەعید

پاییزی 2010

# پێشەکی

## بەشی یەکەم

## چۆن و لە کوێوە دەست پێ بکەین

پرسیار١/ کاك ئەحمەد هەر چەند(مزاحمی وەختی مبارەکت) دەبین لە بارەی چەند باسێکەوە پێویستمان بەشی کردنەوەو ڕون کردنەوە هەیە بەڵکو وەڵاممان بدەنەوە، ئایا قۆناغەکانی دەعوەت حەتمەن دەبێت ببڕێت، واتە قۆناغەکانی نهێنی و ئاشکرا لە خەباتی ئیسلامیدا شتێکی حەتمین یان مەسەلەی گرنگ و سەرەکی دەعوەت کردنە جا بەهەر شێوەیەك بێت لەو شێوانەی لە سیرەی پێغەمبەر( ﷺ) هەیە، بۆ نمونە ئەگەر لە وڵاتێکدا ماوە هەبێت و بارودۆخ لە بار بێت بۆ ئەوەی پیاوانێك پەروەردە بکرێت هەر پێویستە سەردەمی نهێنی کاری (مالی أرقم کوری أرقم) هەبێت؟

جیاوازی یەکانی نهێنی کاری و حزبایەتی چی یە؟ ئایا لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) نهێنی کاری هەبوە یان ڕێکخراو و کاری حزبانە (بەم شێوە حزبایەتی یەی کە ئەمرۆ هەیە) یان هەر دوو کیان هەبون؟

بسم الله الرحمن الرحيم

وەڵام/ الحمد الله رب العالمين واستهديه واسئله بأخلاص والتوفيق، وصلوات الله وسلامه ورحمة الله وبركاته على محمد( ﷺ) واله وصحبه المخلصين وجميع احبابه.

کاکە گیان بەر لەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە لەبارەی ئەو سیفەتەوە کە بۆ وەخت و کاتی من بەکارت هێنا، تێ بینی و ئاماژەیەك بکەم، لەناو

ڕستەکەدا وتت (وەختی مبارەکت)، (موزاحمی وەختی موبارەکت) دەبم- ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی ڕێك و پێك نی یە، وەخت لە خودی خۆیدا تێپەڕین و گوزەری زەمانە نیسبەت بە اشیاء بەتایبەتی – موجودات- دروست کراوە زیندووەکان و بەتایبەتی مرۆڤ، وەخت خۆی هیچ بایەخێکی نی یە، وەخت بەرزی و نزمی نی یە لە پەیوەندی لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا، بە پێ ی ئەوە کە مرۆڤێك چۆن لەو کاتە سود وەردەگرێت دەردەکەوێت. (ئەو بەشە لە زەمان کەپێ ی دەوترێت وەخت و کات) لەوانەیە بەپێ ی بەکارهێنانەکەی بایەخی ئەو کاتە بچێتە سەرەوە یان بێتە خوارەوە، ئەگەر وەخت و کاتی من کرایە سەرو کاری – واجبات، مستحبات، مباحات – هەر جۆرێك لە جۆرەکانی – ئەرك- وە بە ئیخلاصەوە بو، بە تحری و تجسی و هیدایەتی الهی یەوە بو، ئەو وەختە موبارەك دەبێت، ئەگەر وانە بو، وەختێکی پوچە یان خوا نەکردە وەختێکە خراپە، وەختێکی نا موبارەکە. برالەی خۆشەویستم تۆ ئەو پرسیارەت کرد، بیر بکەرەوە بزانە چەندە بە بایەخ – ئەرزش – بو پرسیارەکەت، سەبارەت بە وەخت و شوێنی گشتی جولانەوەی ئیسلامی دەدوێیت و دەپرسیت لە من، واتە ئەوەی وا خوا فەرمویەتی بۆ تەواوی دەورانی پێغەمبەرایەتی – رسالەت- وە ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستی خوا( ﷺ) لە ماوەی تەمەنی موبارەکیا کاری پێ کردوەو دابینی کردوە. ئەگەر من شایستەی ئەوە بم وەڵامی پرسیاری ئاوا بدەمەوە بە هیدایەتی خواو بەئیخلاصەوە بێت، وەختی لەمە موبارەك ترم دەبێت؟.

کاکە گیان تۆ خەریکیت بە پرسیارەکەت وەختی من موبارەك دەکەیت کەچی دەڵێیت – مزاحمی وەختی مەبارەکت دەبم!!؟.

یانی وەختی من موبارەکت ترە لەوەی پرسیاری ئاوا بکەیت و من وەلامی بدەمەوە؟!!.

نەبەخوا کاکە گیان من بێ جێی دەکەم باسی موبارەك تر لەباسی دینی خودا و شوێن و شێوەکاری پێغەمبەر( ﷺ) بەکەم.

جـا بـا بچینە سـەر باسـەکە ئـەم باسـە تـۆ بەشـێوەیەکی تایبـەت لـە بـارەی سەردەمەکانی نهێنی کاری و واعلانەوە هێناوتە ژێر باس ولێکۆڵینەوە، باسێکی زۆر درێژ تر و فراوان تره لەوە کە تۆ باست کرد، تـەواوی بەرنامـەو شێوەکارو هیـدایات و شـێوەی تبلیـغ و ئـەحکامی ئیسـلام هـەموی دەگرێتـەوە، کورتـەی مەبەسـت ئەوەیـە کـە ئیسلام بەسـەرجەم لـە مـاوەی(٢٣) سـاڵ دا بەچەشـنێکی تایبەت لەلایەن ڕابەری ئیسلامەوە جێ بەجێ کـراوەو گەیشتۆتە ئـەنجام، ئـەو ئەندازەیەی کە لەو سەردەمەدا زەمینەی هەبوە، ئایا لـە هـەمو ڕۆژگارێکدا لـە هـەمو بارێکـەوە (نـەك هـەر لـە بـاری نهێنـی و ئاشـکرا) موسـڵمانان خـەیاڵیان هەبێت، جوڵانەوەیەکی ئیسلامی دەست پێ بکەن ئەبێت مو بە مو بـەپێی ئـەو بەرنامە تایبەتی یە کە قۆناغ بە قۆناغ گۆرانکاری بەسـەر دا هـاتوە دەسـت پـێ بکەن و بجوڵێنەوە؟

تەنانەت لەبارەی – ئەحکامەوە- ئەگـەر سبەینێ کۆمـەڵێك موسـڵمان وایـان بۆ هەڵکەوت بـە ئاسـان تـرین شـێوە کۆمەڵگایـەکی ئیسلامیان پێـك هێنـا، ئایـا پێویسـتە لەسـەر شـانیان وەك ئـەوەی لەسـەرەتاوە تاکۆتـایی کـراوە ئـەنجامی بدەنو بیکەن؟ لەوەڵامدا نەڵێم نەخێر وانیی یە

درێـژەی ئـەم باسـە لەباسـێکدا بـەناوی – حـدود و قصـاص- بـە فارسـی نوسـیومە، چـەند جـارێکی تـریش لـە سـەردەمی شۆرشـی ئێرانـدا لـە چـەند جێگایەکی جیاواز کورت یان درێژ لەم بارەوە شتم نوسیوە، کۆمەڵێك لە برایان وایان پێ باشەو هەروەها قسەکەشیان راستە کە مـن سـەرجەمی ئـەو شتانەی لـەم بارەیـەوە نوسـیومە کۆیـان بکەمـەوە و کـەمێك ڕون تـرو سـادە تـریش بێت،(چونکە ئـەو باسـانە کـە نوسـراون بـۆ عولـەمای ئێرانـی نوسـراون، عیلمـی نوسیومە و زۆر شیم نەکردۆتەوە) بەڵام پاش ئەوەی لە زیندان دەرچوم لەبـەر ئەوەی نەخۆش بوم، هـەروەها کـاری زۆر کـەوتوە بەسـەر یەکـدا، مـاوەی ئـەوەم نەبوە بەسەریانەوە کار بکەم، خوا هەرچی خێرە بۆ دینەکەی و بۆ بەنـدەکانی پێش بهێنێت، ڕەنگە ئەمەش خێرێکی گەورە بێت ئەگەر بتوانم ئـەم باسـە بـە

ڕێك و پێكی بنوسمەوە، کەپێم وایە زۆر درێژ دەبێت، که ئێستا پێم باش نی یە تەواوی ئەوەی وا لەو کۆمەڵە باسە درێژەدا باس بکەم بەڵام بە کورتی بۆت باس دەکەم.

پێشەکی ئـەم کورتەیـە ئەوەیـە کـە – تـدوین – نوسـینەوەی قورئـان بـەو شێوەیە کە جبرئیل(عليه السلام) بەپێ ی (فێرکردن و پەروەردەکردنێك) که خوا بۆی دیـاری کردبـو کـە بـە محمـدی(ﷺ) بگـەێنیت، پێچـەوانەی شـێوەی هاتنـە خـوارەوەی قورئانــە، (پێچــەوانە واتــە وەك ترتیبـی نـزول نـی یـە) هاتنـە خوارەوەی قورئـان سورەت بـە سورەتی یـان ئایـەت بـە ئایـەت بـە شـێوەیەکی تایبـەتی بـوە، بـەڵام نوسـینەکەی بـە شـێوەیەکی تـرە، چـەند ڕاز هەیـە لـەم مەسەلەیەدا...!!

بە ڕاو تێگەیشتنی من گەورەترین ڕازی ئەوەیە ئەگەر نوسـینەوەی قورئـان وەك نازل بونی بوایە موسڵمانان وایان ئەزانی لە هەردەمێکی مێژودا و لە هـەر شوێنێکدا جوڵانەوەیەکی ئیسلامی ڕێك بخەن لـە کۆمەڵگەیـەکی تـەواو جاهیلی دا[1] کـە حـوکم و بەرنامـە و عـورف لـە دینـی خـوا وەرنـەگیراوە دەبێـت بـەو شێوەیە کاربکرێت که سەرەتا محمد(ﷺ) کردویەتی.

ئەگەر موسڵمانێك لەو کەسانە بێت وا –أئمـه الهـدی– یـە –مهـدیون–[2] کە هەردەبن خوا زیاتریان کات، اخلاصیان زیاتر بکات، پاشان تـوفیقی هیدایـەت و خزمەتیان پێ بدات(بونی ئەم – ائمه الهدی – یە نەك هەر لەبەر ئـەوەی ئـەم مەسەلەیە لە حەدیثدا باسکراوە بەڵکو لە قورئانیشدا هەر ئەمـە نیشان دراوەو دەرك دەکرێت).

خوا بەرنامەی بـۆ هەمیشـەی مـرۆ نـاردوە، بـەڵام مـرۆ بەهۆکاری جۆراو جۆرەوە لێی دور دەکەوێتەوەو لێ ی بێگانە دەبن، خوا لە هەردەمێکدا کەسـێك دەنێرێـت نـەك لـە١٠٠٪ وەك پێغەمبـەر(ﷺ) لـەم ئیشـە بزانێـت، بـەڵام هەریەکـەیان بـە ئەندازەیـەك دەزانێـت، کـە وردە وردە ئـەو ئەنـدازەو ڕێـژە کەمانە دەگاتە ئەنجام و دەبێتە هۆی ئەوەی جارێکی ترخەڵك دین بناسـنەوە و

بیکەنەوە بەرنامەی ژیانیان، ئەگەر یەکێك لەم – سابق بالخیرات – ائمە الهدی – انە بیەوێت لە کۆمەڵگەکەی خۆیدا کە فەرز بکەین زۆر جاهلی یە و هیچی لە ئیسلام وەرنەگرتوە، هەمو بەرنامەکەی لە باو نەریت و دابی خەڵك وەرگیرا بێت، یان لە کۆمەڵێکی جاهلیی –ئیسلامیدا– بێت[٣]، یان ئەو کەسە بیەوێت لە کۆمەڵگەیەکی إسلامیدا حکومەت بگرێتە دەست و فەرمان ڕەوایی بکات کە جاهیلیەتی تێدا نەبێت، ئەگەر نوسینەوەی قورئان وەك نازل بونی بوایە وەك ئەوەی لە ماوەی ئەو ٢٣ ساڵەدا کە لە ڕۆژی یەکەمەوە دەڵێت ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ تا هاتنی دوا ئایەت، ئەو سابقین بالخیراتە بە شێوەیەکی گشتی پەیرەویان لەوە دەکرد، بەڵام خوا ئاگادارە کە - وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ – ئەو جۆرە جاهلیەتە، کە لەو کۆمەڵگەو سەردەمەدا بو کە ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) ڕاشەکێنە هاتو ڕایشەکاندو زنجیری جاهلیەتی لە گەردنی خەڵك کردۆتەوە، ئەو جاهلیەتە خاوەنی ئەو تایبەتمەندیانە بو کە شێوازی پەروەردە بونێکی تایبەت بەخۆی هەبو، کە قورئان دەڵێت هەرگیز نابێتەوە، هەزاران جۆر لە جاهیلیەت دێتە کایەوە بەڵام ئیدی ئەو جارێکی تر نایەتەوە مەیدان، ئەو ترتیبی نزولە بۆ ئەو جاهلیەتە تایبەتی یە بو کە هەرگیز نابێتەوە، بەڵام لادان لە دینی خودا هەر دەبێت زۆر یان کەم، جاهلیەت هەر دەبێت جا یان کامڵ و تەواو یان تێکەڵ و پێکەڵ، لەبەر ئەوەی جاهلیەت پلەو جۆری زۆرە هەر سابق بالخیراتێك کە دەیەوێت ئامبازی جاهلیەتی کۆمەڵگەکەی ببێت، پێویستە بە اجتهادێکی زۆر باش، هەروەها بە ڕاوێژکردن[٤] لەگەڵ کەسانی تردا ئەگەر بۆی بڕەخسێت، لەهەر ئەندازەیەکدا کە دەتوانێت سود لە اجتهادی زانایانی تر وەربگرێت، اجتهادی باش بکات وە بزانێت جاهلیەتی کۆمەڵگەکەی چ جۆرێکە؟ چ ئەندازەیەکە؟ دەبێت چۆن دەست پێ بکات؟ و کاری تێدا بکات؟ یان شایەد جاهلی نی یە و اسلامی یە، بەچ شێوەیەك دەست پێ بکات؟ بە پیادەکردن و دابین کردنی ئەحکامی اسلام؟

بۆ نمونە کۆمەڵگای کوردەواری خۆمان کۆمەڵگایەکی جاهلی – اسلامی یـە، شـارێك بسـپێرین بـە تـۆ، شـتێکی زۆر سـادەی تێـدا بکـەیت واتـە –احکـام–[٥] خـەریکی دابـین کردنـی احکام بیـت، زۆر شـت هەیـە لـە کوردسـتاندا چـەندین سەدەیە وێڵ کراوەو باوی نەماوە، لە کامیانەوە دەست پێ دەکەیت؟

بۆ نمونە دابین کردنی –حدود– بەسەر ئەوانەدا کە خراپە دەکەن، اقامـەی قسط –مادی و معنوی–[٦] لە نێوان هەمو خەڵکدا.

کەواتە هەمان شێوە جوڵانەوەیـەکی اسـلامی لـە هـەر شـوێن و سـەردەمێکدا پێویست ناکات قۆناغـەکانی نهێنـی و ئاشـکرا و کـۆچ کـردن وهتـد وەك ئـەوەی لەسەردەم و کۆمەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بـو پیـادە بکـرێن، چونکە خـۆ بـاقی تـری ئەحکام و هدایات و ارشادات کە پێویستە بگەیێنێتە خەڵك ناکرێت وەك ئـەوەی هەوەڵ بێت، چونکە جاهلیەتەکان جۆراو جۆرن، ئەگەر بڕیار بێـت بـە شـێوەی سەرەتا بێت، ئەبێت هەر سابق یێك بڵێت ئەی خەڵکینە وەرن جارێ ڕۆژو نیـە، یەکەم جار هەمو بڵێن(اقـرأ) ئەگـەر ئـەو ٢٣ سـاڵە موبارەکە مـو بـە مـو دابـێن بکرێـت، دەبێـت ئەوانـەی وا دەیـزانین بێوەسـتێنین و لەسـەرتاوە دەسـت پـێ بکرێتەوە.

بە عەقل مرۆڤ دەزانێت کە نەخێر پێویست ناکات مو بەمو ئەوەی وا کراوە لـە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی رسـالەت دابـین بکرێـت، بـەڵکو بـە پـێ ی رێـژەی جاهیلیەتی وڵاتەکە دەگۆرێت.

ئەم کورتەیە بەسە بۆ ئەو کەسەی کە دەیـەوێت بەنـدەکانی خـوا هیدایـەت بکات کە مو بەمو دابینکردنی دەورانـی رسالەت کە بـەپێی نـازل بـونی ئایـەت بڕیاری لەسەر دراوە لە هەر سەردەم و شوێنێکدا دوبارە کرێتەوە.

نظم لە ئەلف و بێ ی تعلیماتی دینە، هەر کەسێك هەرلە بـەیانی یـەوە بـۆ عیبادەت و جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی دەزانێت پێویسـتی بـە بەرنامەیـەکی رێك و پێکە تا ئەگاتە ئەوەی(رێك و پێکی لـە بەرنامـەی کۆمـەڵێکی دینـی دا) کە دەیانەوێت بەیەکەوە هیدایەتی خەڵك بکەن، کەواتـە تنظیمـات (وتشـکیلات

بەمانا لوغەویەکەی هەر لەسەرەتاوە کە سابق بالخیرات هەر خۆیەتی ئاواتی هەیە کە خەڵك ڕاشەکێنێت و لەجاهلیەت رزگاریان بکات پێویستی بە – نظم –ە (بەڵام بەمانا لغوی یەکەی)، باشترین بەڵگەی – نظم – نوێژەکانە بەکات و ئەرکانی یەوە، رۆژوە(دەست پێ کردنی و تەواو بونی)، بەم شێوەیە دەبێت هەمو کارەکانی تری ئاوا رێك وپێك دەست پێ بکات(بەڵام بەمانا عورفی یەکەی)؟ نا.

(لە کتێبێکدا بە ناوی حکومەتی اسلامی ڕۆنم کردۆتەوە کە – ڕابەریی – سێ قۆناغی هەیە)

١-سەردەمێك کە سابق بالخیرات-ێك(لە زنجیرە و میراتی پێغەمبەران) (ﷺ) دەست دەکات بە هەژاندن و جوڵاندنی خەڵكو خۆی بەتەنیایە ئەمە قۆناغی یەکەمە.

٢- قۆناغی دووەم سەردەمێکە کە ژمارەیەك دوای ئەم دەعوەتە دەکەون و بڕیار دەدەن بەپێ ی بەرنامەی خوا بژین کە ڕابەری کردن و جێ بەجێ کردن کاروبار- مشاورە-یی یە.

٣- قۆناغی سێ هەم پاش مردنی ئەو ڕابەرەیە کە کاری ئەو جوڵانەوەیە دەبێتە شورا.

بەرنامەی کارکردن بە پێ ی ئەم سێ قۆناغە دیاری دەکرێت. ئاشکرایە قۆناغی یەکەم کە ئەو-سابقە-تەنیایە زۆر بەئاسانی کاری خۆی ڕێك دەخات و کێشەیەکی نی یە، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا کە ژمارەیەك پەیڕەوی لێ دەکەن و دەوری دەدەن دەبێت بەرنامە و کلێشەیەك کە گونجاوی قۆناغەکەیان بێت دابنرێت،[٧] کەواتە هەر قۆناغێك لەو سێ قۆناغە بەرنامە و ڕێکخستنی کاروبارەکان جیاوازە و دەگۆڕێت[٨].

یەکێك لە هەڵە گەورەکان ئەوەیە کە ڕەچاوی سەردەم و قۆناغی دەعوەت نەکرێت و سابق بالخیرات-ێك ڕێکخراو وکۆمەڵەیەکی گەورە دروست بکات کە

قـورس تـر بێـت لـەوەی وا توانـای ئـەو خەڵكـە بتوانێـت ڕایبگرێـت، بەراسـتی خەتەرێكی گەورەیە.

بـۆ نمونـە لەبـەردەمی ئـەو تەكلیفـە دووەمـەوە كـە بـە ئەسـتۆمان گـرت مەسەلەی ڕێكخراوو كۆمـەڵ گەری تەشـەنەی سـەندبو لەناوماندا كە ئەبوایـە لەگەڵ داماڵینی ئەو تەكلیفە دووەمی یەدا خۆمان ڕزگار بكردایـە لـەو هەسـتی حزب بازی و جەماعەت گەری یە[١٠]

ئەگەر وبێت ڕێكخراو دروست كردن-(نظم- بەمانا لغوی یەكەی نەك بـەمانا ئەمرۆژیەكەی(حزبایەتی) ئەبێت ببێت بەڵام گونجاو بێت لەگـەڵ پـەروەردە و تەزكیەی ئەو كەسانەدا كە بریارە لە ژێر سایەی ئەو-نظمـە داكۆببنـەوە، نـەك خوانـەكردە توشـی غـرورو بـێ تـەقوایی بـبن، بـەپێی ڕادەی زانـین وئیمـان و اخـلاص و تـەقوای خۆیـان هـەنگاو هـەڵبهێنن، بـە ئەنـدازەی تزكیـە و تـەقوای خۆیان ڕێكخراوەكەیان زیاتر و گەورەتر بكەن بۆ ئەوەی توشی ئەو هەراو شـەڕ و نەخۆشی و گرفتاریانە نەبن وا حزب و ڕێكخراوە غیر اسلامی یـەكان بەدیان هێناوە و توشی بون.

★ ★ ★

پرسیار٢/ ئایا مەسەلەی دابڕان ووێڵ كردنی كەسوكار و خزمـو خـەڵك، لـە نزیك ترین تا دوورترین كـەس، لـە چ كاتێكدا دەبـێ وڕای كتـاب و سـنەت چـی یە؟ (مفاصله و مفارقه).

وەڵام/ ١-هەم ئایەتی قورئان زۆر جار ئەمەی دەرخستوە، (بـۆ نمونـە كاتێـك كە دەڵێـت-فَأعْرِضْ عَن مَن تَـوَلَى عَـن ذِكْرِنَـا-یـان-وتـولی عنـهم- وەك تەماشـای مێــژووی اســلام دەكــەین و لــێ ی حــاڵی دەبــین، دووەم ســونەتی عەمــەلی پێغەمبەر(ﷺ) (هەر چەند ئەزانین (نوسینەوەی) سیرە كەم و كوڕی و هەڵەی تێدایە، بەڵام مـرۆڤ دەتوانێـت بصیرەتێكی گشـتی لـە هـەر سـەردەمێكدا پـەیدا بكات) بە پێ ی ئەو بصیرەتە ئەزانین كە زۆر جوان بەیانی كردوە بۆ ئیمە.

ئەگەر خەڵك لێی خراپ تر نەبێ لە عمەلدا، لێی ملحید تر نەبێ لە باوەڕدا، لەسەردەمی تبلیغ و تزكیە و دەعوەتی گشتی دا، هیچ مفارەقەیەك ڕێ ی پێ نادرێت، خزمە، كەس و كارە، بێگانەیە، بە هیچ جۆرێك.

ئەما سەردەمێك هەیە كە دەگاتە كۆتایی و نۆرەی دروست كردنی ئەو ڕێكخستنەیە(پێش دروست بونی حكومەت و لە كاتی حكومەتدا) ئەو كاتەیە كە چەند مەسەلەیەك دێتە پێشەوە(هەمیشە وەك ئەوەی لەسەرەتادا كرا بە پێ ی سونەتە هەوەڵی یەكە) بە شێوەی جۆراو جۆر و گونجاو، لەگەڵ سەردەمی جۆراو جۆردا ئەبێت مفاصلە بەدی بێت، تەنیا لە توانای حكومەتدایە ئەم كارە دیاری بكات، تا توانای موسڵمانان نەگاتە نزیك ئەوەی كاروباری كۆمەڵێك بەرێوە بەرێت، ناتوانێت بڵێت من ئەم كۆمەڵە ئەكەم بە دوو بەشەوە، بەشێكی دروست و بەشێكی نا دروست، هیچ كەس هەقی ئەمەی نی یە.

★ ★ ★

پرسیار٣/ زۆربەی موسڵمانان هەر ئەوەندەی بزوتنەوەیەكی دینی ئەناسین چەند كتێبێك دەخوێنینەوە، چوار رۆژوی سونەت دەگرین، ئیتر پاش ماوەیەكی كەم تورە ئەبین لە دایك و باوك و خوشك و براو تەواوی كەس و كار، هەروەها بونی ئەو ڕێكخستنە ئەبێتە هۆی ئەوەی كە پەیوەندی ئەندامانی ئەو ڕێكخستنە زۆر پتەو بكات و هەر ئەمە دەبێتە هۆی دور كەوتنەوەیان لە خەڵك ئایا چاری ئەم دەردە چی یە؟

وەڵام/ نە قورئان و نە سونەتی نبوي هەرگیز ڕێگەی ئەمە نادا، ئەمە هەڵەیە، ورد بەرەوە لە سونەتی نبوی كە تانزیك ترین رۆژ لە هیجرەت پەیوەندی بوە لەگەڵ سەرانی جاهلیەتدا، باسی كردوە لەگەلیان، هەروەها لەگەڵ باقی خەڵك، دەستی هەڵنەگرتوە لە تبلیغ و هیدایەتیان، كاتێك كە فەرمانی(هیجرەت و تولی واعراض) دراوە ئیتر ئاشكرایە كە ئەمەی لە رابردو دا كراوە هیچ دەوری نەبوە و وەختی ئەوە هاتوە تبلیغ بگوێزێتەوە بۆ

جێگایەكی تر، لە حاڵەتێكدا لەم كاتەشدا هەر بە تەواوی تەركی نەكردون و لەهەمان كاتی-تولی واعراضدا- هەوڵ وكۆششی داوە بۆ هیدایەتیان بەڵكو هیدایەت بن و خۆشبەخت بن ئەمە لەلایەك.

لە لایەكی ترەوە صیلەی ڕەحم بۆ نزیكان بەتاڵ نابێتەوە مەگەر ئەو كاتە كە حكومەتێك دیاری بكات، ئەویش ئەزانێت كە پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا دەبێتە هۆی تێك چونی كۆمەڵ، ئەم دوو بەشە دەبێت جوێ بن لەیەك مەگەر ئەم كاتە ئەگەر نا بە هیچ جۆرێك ناپچرێنرێت، لە پاشاندا لەناو-ڕەحم- دا دایك و باوك، ورد بەرەوە لە نصی قورئان دەفەرموێت ئەگەر وا داوایان لێ كردیت بۆ شرك بەقسەیان مەكە بەڵام پەیوەندیت لەگەڵیان دا هەر باش بیت هەر بە احسان، بە اكرام، لەگەڵیان دا بجوڵێرەوە، باوك ئەدا بەسەرتدا، دایك نەفرینت دەكات، زۆرت لێ دەكەن سوجدە ببەی بۆ بتەكان(شركی تەواو سادەو بدیهی و عینی) ئەبێ بڵێیت دایە گیان توخوا زۆرم لێ مەكەن ناتوانم﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾.

ئەم جۆرە هەست و سۆزە اسلامی یەی كەسانێك كە دەكەونە چالاكی و جولانەوە هەستێكی پاكەو لەبەر خۆشەویستی دینە و پاكی دڵیانە كە تەحمولی ناپاكی و لاڕێ ی ناكەن.

بەڵام برای عزیزم، خۆشەویستم، هەمو ئەو شتانە كە خوێن شیرینن و بەرێزن مەرج نی یە ڕاست بن، ڕێ ی باش باش بون و خەڵك باش كردن خوا باشی دەزانێت، ئەو نیشانی داوین و بەقسەی ئەو بكەین، ئەو بێزاری و بێگانەیی و دوركەوتنەوەیە خوا پەسندی ناكات، لەبەر خاتری خوا با لەو هەست و سۆزەپاك و جوانەی خۆمان(كە ئەمە لە خودی خۆیدا جوانە كە من كەسێكم خۆش نەوێت كە لە ڕێ ی خواوە نارِوات) بەڵام هەر لەبەر فەرمانی خوا با ببورم لێ ی و خۆشم بوێ تا بەڵكو هیدایەت بێت، خۆشەویستی باش ئەوەیە كە كابرا خراپە (تۆ) باشی بكەیت نەك پشتی لێ هەڵبكەیت.

★ ★ ★

پرسیار٤/ ئایا خەباتی پەرلەمانی و بەشداری کردن لە پەرلەماندا بەرای تۆ چۆنە؟

وەڵام/ ئـەم مەسـەلەیە مـو بـە مـو لـە دەقـی کتـاب و سـوننتەدا نابێـت وەربگیرێت، ئەمـەش وەك ئـەو مەسـەلانەیە کـە دەربـارەی دەست پـێ کردنـی جولانـەوە وتمـان ئـەبێت بـە اجتهـاد بێـت، انسـان دەبێـت لەهـەر زەمانێکـدا بیربکاتەوە چی بکات، کۆمەڵگاکان جۆراو جۆرن:-

١-کۆمەڵ هەیە بـارو لایەنـە اسلامی یەکـەی بـەهێزە، بەلایـەنی کەمـەوە لـە هەست و بیری خەڵکدا اسلام هەیە ئەگەر چی لە رەفتار یا بـێ هێـز بێـت ئـەما خەڵك زۆر حەز دەکەن کە کۆمەڵ و حکومەتەکەیان بە پـێ ی فـەرمانی اسـلام بەرێوە ببرێت ئەمە جیاوازە.

٢- لەگەڵ ئـەو کۆمەڵەی تـر دا کـە اسلامی نـی یـە و حـەزو سـۆزو هەسـتی اسلامیی بێ هێزە، پێشەوایانی دینی ئەبێت بە اجتهادی دینی بـەو رێگایـەی وا وتم نەك مەغرور بن و تەنیا بەرەئی خۆیان بەڵکو بەسود وەرگرتن لـە راو بـۆ چونی پێشەوایانی تریش، بزانن بۆ کۆمەڵەکەی خۆیان چی باشە؟

ئەگەر بزانن بە راستی بەبێ ئەوەی رێگایـەکی دورو درێـژ خایـەن ببڕن لـە تزکیـە و دعوەتـدا، وەبـەبێ ئـەوەی ژمارەیـەکی پەیوەسـت و نزیـك بەیـەك بەناوی-أمە-[11] پێکەوە بنێت، ئەگەر ئەو کەسە زانی کە لەم کۆمەڵەدا(کە ئێستا شێوەی امتی نیە) بـەلام هەست و ئامـانج و خۆزگـەی دینیـان هێنـدە زۆرە کـە ئەگەر بزانیت بـێ بڕینـی ئـەم رێگـە درێـژەی حرکت دەتوانێت حکومـەتێك و رێکخستنێکی اسلامی بێتە کایـەوە، زۆر موبارەکـە بڕواتـە پەرلـەمان حکومـەت بگرێتە دەست،(بەمەرجێك ثابـت بێـت لەسـەر رێ و شوێن و بەرنامـەی خـۆی مجاراتی سیاسـی و رێ و شـوێن گـۆڕین و ئـەو جـۆرە تاکتیکانـە وا لـە گـروهـ و حزبە نا اسلامی یەکاندا هەیە نەکاتە ئامێر و تێکەڵی ئەو شتانە نەبێت و ئەو رێگایانە نەگرێتە بەر) اسلام دوای قۆناغی(فاصدع بما تؤمر) کە ئێستا خەیاڵی هەیـە لـە خـەباتی پەرلـەمانی و حکومـەتی دا بەشـداری بکـات، دیـارە ئەمـە

قۆناغێکی زۆر پان تر و تێرو تەسەلْ تـرە لـە قۆنـاغی(فاصدع بمـا تـامر) ئـیتر بەهیچ جۆرێك نهێنی کاری نی یە لە رێباز و ئامانجی دا. نهێنی کاری دوانە:-

١-ئەوەیە کە بنەماو رێبازو ئامانجەکانی نهێنی بێت.

٢- لە کاری رۆژانەو خەباتدا-اجراء

لە یەکەمیاندا بە هیچ جۆرێك نهێنی کاری رێ ی پێ نادرێت﴿فاصدع بما تامر﴾ تەواو ئاشکرا و دیار بێت هیچ نەشارینەوە لە خەڵك، هاوار بکەین ئەمە اسلامە جا چ بەچاکی دەزانیت یا بەخراپ؟ پێت خۆشە یان ناخۆشـە؟ ڕاسـت و پاك بیخەرە بەرچاو، نـەك وەك ئـەو پارت و گرۆهانـەی تـر ئامـانج و رێبـازی خۆیان تێکەڵی شتی تر دەکەن یان تەنانەت بە پێچەوانەی ئـەوەوە وا باوەڕیـان پێ یەتی دەخەنە بەرچاو، دینی خوا دەیەوێت بە بصیرەتەوە خەڵك بانگ کات چاو بەست لەگەڵ خەڵك مەکە و سەری لێ مەشێوێنە بـەدرۆ و دەلەسـە. هـەمو اسلام بەو پەڕی ڕاشکاوی یـەوە ڕابگەیەنـە، جاسازگارە لەگـەڵ فطرەت قبـوڵی ناکـەیت یـان بەخـەیاڵی خـۆت پێـت وایـە مصـالحت لەگـەڵ اسـلامدا جـۆر دەرنایـەت[١٢]. ئەگـەر ئەچـنە نـاو تەشـکیلات و حکومـەت و پـێ یـان وایـە کۆمەڵەکەیان لەروی عواطف و امالی دینی یـەوە ئەوەنـدە بـەهێزە کـە بەسـوکە تـەکانێك ئـەو توێژاڵـە لـە جاهیلیـەت لادەچـێت و بـەهار دەکەوێتـە دەرەوە بابیکەن (ئەمما بێ موجامەلە). کۆمـەڵی واش هەیـە بـە هـیچ جۆرێـك بـەکاری ئەمە نایە تەنانەت دەبێت لە قۆناغی نهێنی وە دەست پێ بکات[١٣]

★ ★ ★

پرسیارە/ پەرلەمان لە هەر وڵاتێکدا یاسا دادەنێت، ئەگەر ئـەو پەرلەمانـە بە پێ ی کتاب و سونەت یاسا دانەنێت بۆ ژیانی خـەڵك ئایـا تـۆ دەتوانیـت لـەو پەرلەمانەدا بەشداری بکەیت ئایا ئەمە بەشرك دانانرێت؟

وەڵام/ وەك وتم بـۆ هـەر شـوێن و سـەردەمێك لەوانەیـە هـەڵ و مـەرج و بارودۆخێکی ببێت کە پێویست نەبێت وەك شێوەی ٢٣ ساڵەی رسالەت ڕەفتار

بكـەیت، وەك نمونــەم هێنایــەوە جاهلیــەت توێــژاڵێك ســەهۆڵە بەســەر ئــەو كۆمەڵـەوە بەشـەماڵێك لادەچـێت و دەتوێتـەوە وەختێـك ئـەزانیت ئاوایـە، بـە ڕاستی لـەڕوی ئیجتیهادێكی دروستەوە نـەك بەخـەتاو یـان ئـاوات و ئـارەزوی گەیشتن بە دەسەلات هانت بدات، ئەمەیان نەءئەگەر ئەچنە شورایەك اقلیەتـە ناتوانیت ڕەئی خۆی(ئـەویش ئـەو اقلیـەت واكثـریەتـە جاهلیـەی ئـەم ڕۆژە كـە تـەنیا بـەپێ ی دەسـەلات دیـاری دەكرێـت، نـەك بەپێوانـەی نزیكی و دوری لـە هـەق لـە كاتێكـدا اصـل ئەمەیـە) بـەڵێ دەزانـین بـەپێ ی عـادەتی ڕۆژ زۆربـەی خەڵك یاساو بەرنامەی عادەتی و سەردەمیان پێ خۆشە تـا یاسای وەرگـیراو لـە دیــن، ئــەوە نابێتــە ڕێگــر كاتێــك زانــی كۆمەڵگاكــەی ئاوایــە، ئەچــێتە پەرلەمان(بـەلام بەئاشـكرا بـەیانی دەكـات كـە حـوكمی اسـلام ئەمەیـە)، ئەگـەر یاسایەكیان —تصویب- كرد لەو پەرلەمانەداو لەگەڵ اسلامدا نەگونجێت دەبێت دژی بوەستێت و ڕای پێ نـەدات، ئـیتر دوای ئـەوەی بـە ئاشكرا دژایـەتی خـۆی دەربڕی ئەرك و گوناهی بەسەرەوە نامێنێت.

* * *

پرسیار ٦/ زۆر لە موسلمانان ڕایان وایە لە هەر شوێنێكدا كە دەست دەكـەن بـە چـالاكی اسـلامی پێویسـتە هێزێكـی چـەكداریان هـەبێت بـۆ ئـەوەی كـەس ئازاریان نەدات و بەئیسراحەت خـەریكی تبلیـغ و دعـوەی خۆیـان بـن، ئایـا ڕات بەرامبەر بەم دیاردەیە چی یە؟

وەلام/ ئەمـەش هـەروەك مەسـەلەكەی رابـردوو بـەپێ ی كۆمـەلگای جـۆراو جۆر وە بەپێ ی قۆنـاغ و زەمان و زەمینەی تایبەتی ئەو موسڵمانانە دەگۆڕێت.

بۆ نمونە:- لە سەرەتای شۆڕشی ایرانەوە كە نەیارمان ئێجگار فـرە بـو، خـۆم چەكم هەلگرتبو وە هەروەها ڕامسپاردبو كە موسڵمانان چەك هەلگرن بەلام بە هیچ جۆرێـك- مـاوەی شـەڕمان نـی یـە- ئەمـە مەسـەلەیەكی گشـتی یـە كـە زۆر كەس پێ یان وایە لـەدوای ئایـاتی(قـاتلوا الـذین یقـاتلونكم) حـوكم دەگـۆڕێـت و شەر فـراوان تـر دەبێت، هەڵەیـەو وانـی یـە، ئایـەتی تـریش كـە مەیدانی شـەڕ

فراوان تر دەكات هەر بۆ(الذین یقاتلونكم)ە ئەو كاتە رونم دەكردەوە بۆیان تەنانەت ئەوان شەڕیشمان لەگەڵ بكەن دروست نی یە ئێمە شەڕیان لەگەڵ بكەین، تا ئەكرێت با هەر دەورانی مەككە بێت، هەر خۆمان بپارێزین و نەیەڵین توشی شەر بین نەك خەڵك بكوژرێن و شەر بكەین(بەڵگەو دەلیل زۆرە لێرەدا درێژە دەكێشێت ئەگەر باسی بكەم ) سادەترین بەڵگە ئەمەیە- كەسێك كە ئەیەوێت ئێمە بكوژێت یان ئازارمان بدات لە قوڵایی دڵیەوە پێ ی وایە —ئێمە خائنین- ئێمە خراپین، لەم كاتەدا ئەو خەریكە خراپ دەكوژێت، خائین دەكوژێت... بۆ؟

لەبەر ئەوەی تا ئێستاش ئێمە ئەركی دینی خۆمان جێ بەجێ نەكردووە(قد تبین رشد من الغی) كاتی نەهاتوە، تا ئەو بزانێت ئێمە چی دەڵێین و لەبەر باشی مەسەلەكەمان بمانكوژێت(لەوانەیە یەكە یەكەیەك بزانن كە مەسەلەكەی ئێمە باشترە لەوان بەڵام خۆ ئەوانە نین كە چەكدارن و دێنە شەڕی ئێمە بەڵكو كەسانێكی زۆر سادەو داماون كە وایان حاڵی كردوون كە ئێمە تاوانبارین و ڕێگەكەمان ڕێگەی خۆشبەختی خەڵك نی یە و ڕێگەی فلان حزب و دەستە باشە)، هەر كەس حزبی خۆی بەباش دەزانێت(كل حزب بما لدیهم فرحون).

كاتی رو بەرو بونەوە لە شەڕدا لەگەڵ ئەم كەسە سادەو فریو دراوانە بكوژیت قاتلیت، بكوژرێیت هەر قاتلیت، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی دەستوری خوا شەڕت كردووە(ئەمە نمونەیەكی سادەی ئەو سەردەم و شوێنەی خۆمان بو) بەڵام هەمیشە وا نیە، برێك كات وا پێویستە كە تەنانەت چەكی خۆپاراستنیش هەڵنەگریت(وەك ئێستای مكتب قران كە چەكیان پێ نی یە)، بەر لە شۆرش كە ئەو هەراو هۆریا گشتیە لە ئێراندا دژی شا دروست بو چەكمان نەبو(ئێستاش مەگەر كەسێك وەك جاران هەر لە ماڵی خۆیدا چەكی هەبێت بۆ پارێزگاری لە ماڵ و سامانی خۆی) نەك بۆ شەڕێكی دینی كە من موسڵمانم و بەرامبەرەكەم نا موسڵمان.

بەڵام لەوانەیە سەردەم و شوێن هەبێت کە موسڵمانان وەك ـامـة تێکیـان لێ هاتبێت(هەر چەند سنوردارو بچوك) وە بۆ پارێزگاری لە خۆیان پێویست بکات چەکدار بن، بەڵام نەك بۆ –قتال- تا قۆناغەکەیان نەگەیشتبێتە جیابونـەوەی- رشدوغي-(کە حزب و دەستە و گروهی جیاجیا پێ یـان ئـەوێرن و دەرەقـەتیان نەیەن).

ئەمەش دیسان هەر مەسەلەیەکی اجتهادی یـە کـە پێشـەوایانی دیـن دوای هەڵسەنگاندنی کۆمەڵگای خۆیان بۆیان دەرکەوێت-تکلیفیان چی یە-.

★ ★ ★

پرسـیار ٧/ مەسـەلەی سمـع و طاعـە لـە اسلامدا چۆنە و بـۆ کـێ یـە؟ ئایـا ئەوانەی بە پەیڕەوەکانیان دەڵێن وەك صحابە سمع و طاعەی مطلقتان هەبێت بۆمـان تـا چ ڕادەیـەك دروسـتـە؟ ئەمـە شـێوەکار و پرۆگرامـی حزبایـەتی ئـەم سەردەمەیە، ئایا بەرنامەی اسلام بۆ کۆکردنەوەو تواناو هێـزی موسـڵمانان چـی یە؟

وەڵام/ مەسەلەیە کە لێرەدا باسکراوە بمانەوێت باش ڕۆشن بێت، واتـە سمـع و طـاعـەی جـۆراو جـۆر ڕون بێتـەوە باسـێکی درێـژە، بـەڵام لـەجیاتی ئـەوەی بەدرێژی باسی بکەم برێك سادەترو کورت باسی دەکەم، هەر مرۆڤێك لە ژیاندا هەم تقلیدی پێویستە هەم اجتهاد، لـە منداڵێکەوە کـە گروگاڵ دەکات و وردە وردە فێـری بیسـتن و قسـەکردن دەبێـت تـا جوڵانـدنی دەسـت و پـێ ی- هـەم اجتهادی هەیە هەم تقلید- تا ئەگاتە پێغەمبەرانی خوا( ﷺ) بۆ؟

چونکە مرۆڤ کۆمەڵێکە لە زانین و نەزانین، ئەوەی لە هـەمو کـەس زانـاترە کـەمێك هـەر نەزانیشـی هەیـە، جـا لەمەسـەلەیەکدا بێـت یـا لـە کـۆی هـەموو مەسەلەکانی مرۆڤدا.

پێغەمبـەران( ﷺ) وەحیـان بـۆ دێـت کارمەنـدی دابـین کردنـی ئـەو وەحـی یەن، کامڵترین وەحی الهی هاتۆتە خـوارەوە بـۆ گـەورەترین دڵ کـە بەرگـەی لـە

کێوان زیاتر بو بۆ وەرگتنی ئەو-وحی-یە، لەگەڵ ئەمەدا کە لێپرساوە لەوەی رەفتاری بەپێ ی ئەو وەحی یە بێت، هەندێ جار قورئان رەخنەی لێ دەگرێت بۆ نمونە ﴿عفا الله عنك لم اذنت لهم﴾ لەشەری رۆمدا دەوڵەمەندە دەسەڵات دارەکان هاتن (چونکە بەدڵ موسڵمان نەبون و هەر رواڵەت بو) بۆ ئەوەی پێغەمبەر( ﷺ) رێگەیان پێ بدات بمێننەوە و نەچن بۆ شەر لەبەر ئەوەی کێشەو گرفتیان زۆرە، ئەویش رێگەی پێدان، قورئان بەر لە گشت شتێك مژدەی بەخشینی پێ دەدات لەسەر ئەم کارە چونکە تاقی کردنەوەی لەم زەمینە و کارە تایبەتی یەدا نەبوە، وە هەروەها-وەحی-ت بۆ نەهاتبو، بەڵام دەبوایە بوەستایتایە تا وەحیت بۆ دەهات بۆچی وات کرد؟ گەورەترین نێراوی خوا پەلە کردنی دلسۆزانەی هەیە لە پیادەکردنی دیندا (لەکاتێکدا دەزانین هیچ کارزان و پسپۆرێك ئەوەندە شارەزا نی یە لە کارەکەی خۆیدا)، بۆ نمونە:- دکتۆرێك دەزانێت ئەمرۆ زانستی پزیشکی زۆر فراوان بوە و چەندین لقی جیا بۆتەوە، بەڵام ئەو دکتۆرە کە پسپۆرە لە بەشەکەی خۆیدا لەوانەیە هەڵە بکات و پێویست بێت لە دکتۆرێکی تر پرسیار بکات، ئەمە نەك هەر لە پزیشکیدا بەڵکو هەمو نیشێك هەر وایە-تقلیدی-کەمەو-اجتهادی- زۆرە، بەڵام لە باقی بەشەکانی تردا-تقلید-ی زۆرە، وە ئەگەر هەمو لایەن و بوارەکانی ژیان بگریتە بەرچاو سەیر دەکەین ئەم دکتۆرە تقلیدی زۆرە و اجتهادی فرە کەمە، بۆ نمونە لەقەسابی دا یا شوفێری یان خەیاتی یان هەر کارێکی تر کە تقلیدیان پێ دەکات و باوەڕی خۆیان دەداتێ. پێغەمبەران (صلاوات الله وسلامە علیهم أجمعین) و زانایان و پسپۆران و کارزانەکان هەر هەمویان جگە لەبەشە تایبەتی یەکەی خۆیان زۆربەی ژیانیان لەسەر تقلیدە.

بەڵام بەشێك کە رازی ئەم مەسەلەیە بۆ ئێمە رون دەکاتەوە ئەمەیە، کەسێك لەمەسەلەیەك لە مەسەلەکانی مرۆڤدا زۆر کاری کرد دیارە رۆژ بە رۆژ زانینی زیاتر دەبێت و تقلیدی کەم دەبێت و ناوەرۆکی ئەو مەسەلە تایبەتی یەی بۆ رۆشن تر دەبێت، بۆ نمونە-منداڵێك لە کۆڵانێکدا زۆر باش

شارەزای ئـەو كۆڵانـەیـە و ماڵـەكان دەناسێت مـن ئەگـەر عاقـڵ بم بـۆ پرسینی ماڵێك لەو كۆڵانەدا پرسیار لە منداڵی ئەو كۆلانـە دەكـەم نـەك لـە فلانـە زانـاو پسپۆر لەو شارەدا، زوتر باسێكمان كرد لە تراكتۆر و مرۆڤەكە كە دەبێت هـەر یەكـەیان بدرێتـە دەست زانـای خـۆی. ئـەزانین كـە بـۆ پـەروەردەكردنی مـرۆڤ پێغەمبەری خوا( ﷺ) لە هەمو كەس زاناترە[١٤].

كاتێك بمەوێت بزانم چۆن خۆم و مناڵ و هاوەڵەكانم پەروەردە بكەم، چۆن كۆمـەڵم بـەرێوە بـەرم، پێویستە لـە كەسـانێك تقلیـد بكـەم بـۆ ئـەو شـتانەی نایزانم، هەروەك چۆن بۆ چاك كردنەوەی سەعاتەكەم تقلید دەكەم لە سـەعات سازو خۆمی پێ دەسپێرم چونكە ئەمە كارێـك نـی یـە وەك بـاقی مەسـەلەكانی تری مـرۆڤ بتـوانم بـە ئاسـانی فێـربم لەبـەر ئـەوە تقلیـد دەكـەم لـەو كەسـە وا زانایـە لـەم مەسـەلەیەدا، بـەم شێوەیە كەسێك بەهـەر ئەنـدازە كە زانینـی لـە مەسـەلەیەكی تایبـەتی دا زیـاتر دەبێـت تقلیـدی كـەم دەبێتـەوە، تـا دەگەینـە پێغەمبەر( ﷺ) لەبەر ئەوەی راستەوخۆ پەیوەندی بەخاوەن و خالقی مرۆڤەوە هەیە دیارە كە لە هەمو كەس زاناترە، پاشـان دەگەینـە لای خـوا، كـە ئاشـكرایە خـۆی خولقێنـەری ئـەم دەزگایەیـە هـەر خـۆی باشـتر دەزانێـت چـۆن بـەرێوە دەچێت و چی باشە و چی خراپە بۆی.

بەم شێوەیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە سمع و طاعـەی مطلق هەر بۆ خواو پێغەمبـەری خودایـە( ﷺ) ئەگـەر لـە كـاری تایبـەتی پێغەمبەرایـەتی دەرچـو ئیتر- سمع و طاعە‌ی مطلق بـۆ پێغەمبـەر( ﷺ) نامینێـت، وەك لـە سوننەتدا دەیبینین لەو كاروبارانەدا كـە لـە سنوری دینـدا نـەبوە (كاروبـاری دونیـا بـون) زۆر كــەس بــەزانایی‌و شــارەزایی خــودی خۆیــان كاروبــارە دونیاییــەكانیان بەچاكی بەرێوە بردووە.

لەپاش پێغەمبەر( ﷺ) بەو شێوەیە كە باسمان كرد ئـیتر- سمـع و طاعـەی مطلق نامینێت، چونكە ئەو شارەزایی یـە زۆرە و ئـەو توانـا بـەرزە نامێنێـت و

کەم دەبێتەوە، زانایانی گەورەی دین شتی زۆر گرنگیان لەم بارەیەوە وتوە، هەر کەس بە ئەندازەی زانین و تێگەیشتنی پشتیوانی و ڕابینین پەیدا دەکات بە کەسێك وا باوەڕی پێ پەیدا دەکات، باوەڕی زانایەك بەکەسێکی تر زۆر سەنگین ترە و دەبێت لە ڕای کەسێکدا باش بکۆڵێتەوە، بەڵام باوەڕکردنی کەسێکی سادەو عوام ئاسان ترە و کەم ترە، بۆ نمونە لە گوندێکدا کەسێك هەر ئەوەندە زانی مەلای ئەو گوندە لە دین ئەزانێت ئیتر بەسیەتی و پرسیاری لێ دەکات.

بەڵام کاری تۆ ئەوەیە دێ یەك بجولێنیت بەرەو ڕێ ی هەق و خۆشبەختی هەروا بە ئاسانی ناتوانیت-تقلید- بکەیت، دەبێت زۆر هەوڵ بدەیت و خۆ ماندو بکەیت، هەر کەسێك، حزبە، گروهە، ڕێکخراوە، بەرەیە-لا طاعە لمخلوق فی معصیە الخالق- ئەبێت هەر کەسێك بە پێ ی دەرکی خۆی بکۆڵێتەوە لەبارەی ئەو بڕواو رایە تابزانێت ئایا لەگەڵ دینی خوادا دەگونجێت یا ناگونجێت؟.

پاش لێکۆڵینەوە ئەگەر دڵنیا بو کە ڕێکە و سازە لەگەڵ دینی خوادا ئەو کاتە- سمع و طاعەی پێویستە ببێت بۆی نەك لەبەر ئەوەی حزبەکەی وتویەتی یان فلانەکەس وتی، زۆرجار بۆ برایان و خوشکان دووبارەی دەکەمەوە بەتایبەت لەم ڕۆژانەدا، یاخوا دوربن لەو نەگبەتی و شەڕەی کە بڵێن چونکە- احمد- وتویەتی، کە بەم کارە هەم خۆتان هەم احمد قوڕ بەسەر دەکەن، چەندین جار بە قسەو نوسین پێم وتون لەوانەتان وا زانان هەوڵ بدەن زاناتر بن تا ئەندازەی تقلیدتان لە من کەمتر بێتەوە لەبەر ئەوەی ئەگەر هەڵەیەکم کرد پێم بزانن(هەمیشە دەیڵێم کە بە درێژایی تەمەنم چەندین هەڵەم کردوە) (هەر لە سەرەتاوە بە خەڵکم وتوە کە چاو و گوێ بەستراو پەیرەوی لە من مەکەن) ئێستاش هەر هانیان دەدەم بۆ زیاتر زانین و فێربون، وە ئەگەر توانیم بچمەوە کوردستان لەگەڵ ئەوەدا کە ئەرکەکانم زۆر لەوە زیاترە کە دەرس بڵێمەوە پێم خۆشە کە دوو دەرس بڵێمەوە.

١-فقهێكی تقلیدی شافعی.

٢- فقهێكی اجتهادی گشتی.

بۆ ئەوەی كەسانێك پێ بگەن كە ئیتر پێویستیان بە تقلیدی من نەبێت، طاغوت ئەوەیە كە كەسێك بەناوی دینی خواوە بەڵام بەبێ گوێ دان بە دینی خواو لێكۆڵینەوەی پێویست ئەوەی بەبیریدا دێت بیڵێت بە خەڵك وە خەڵكیش- سمع و طاعە یان- بێت بۆی.

دین بۆ ئەوە هاتوە خەڵك لەو- سمع و طاعەیە- رزگار بكات، سمع و طاعە تەنیا دەبێت بۆ خالقی مرۆڤ بێت وە ئاشكرایە كە خودا هیچ بەرژەوەندیەكی تایبەتی و حزبی نی یە و هەرگیز فەرمانێكی پێچەوانەی بەرژەوەندی من دەرناكات.

پاشان پێغەمبەر( ﷺ) –كەدڵنیام- صادق وامین-ە وە باش حاڵی كراوە.

(ئەوەشی هەیە كە نابێت هەر شتێك بە ناوی ئەوەوە ڕوایەت كرا بەهی ئەوی بزانین، دەبێت بكۆڵیینەوەو تاوتوێی بكەین، ئەوەی وا-ائمە حدیث- كۆیان كردۆتەوە مەرج نی یە بۆ زانایەكی دینی بێ لێكۆڵینەوە وەربگیرێت و قبوڵی بكات بەڵكو ئەبێت زۆر باش لە قورئان بنەما سەرەكی یەكانی دین شارەزا بێت و ئەو حدیثە هەڵسەنگێنێت تا دڵنیا بێت ئەو حدیثە هی پێغەمبەرە ( ﷺ)، ئەگەر لە روی سوننەتەوە دڵنیا نەبێت بەڵام لەگەڵ قورئاندا بگونجێت و ساز بێت ئەوە دیارە كە لە قسەكانی پێغەمبەر( ﷺ) ە، ئەو كاتە دەبێت پەیڕەوی لێ بكات بەڵام بۆ زانایەك كە دەتوانێت تحقیق بكات تقلید ڕەوا نی یە)

★ ★ ★

پرسیار ٨/ لە هەموحزب و دەستەیەكدا هەمیشە ئەندامە كۆنەكانی سەرۆكایەتی دەگرنە دەست ئایا لەگەڵ كاری بە كۆمەڵی اسلامیدا دەگونجێت ورای اسلامی لەسەرە واتە بە-اقدمیتە- یان بە أهلیەت-؟

وەڵام/ مەرج نی یە هەمیشە وابێت، بـەڵام زۆربـەی جار بـەم شـێوەیە بـوە، گـەلێك جـار هـەواداران و ئەنـدامانی حزبێـك هەسـت دەکـەن بـە لاوازی و بـێ هێزی ڕابەرایەتی حزبەکەیان هەوڵ دەدەن ئـاڵو گۆڕێـك بهێننـە کایـەوە، بـەڵام زۆربەی کات ئاوایە کە کۆنەکانی دەبنـەـڕابـەر-، بـەڵام ئەمـە ڕاسـت نـی یـە، بـۆ هەر کارێـك اهلیـەت(توانای شخصی) مەرجـە، نـەك‌سابقە- کۆنێتی، لەوانەیـە تۆش کـە لاوێکـی تـازە پـێ گەیشـتویت مـاوەی ٥-٦ سـاڵە دەسـتت پـێ کـردوە لـە فلانـە زانا کە ٥٠ ساڵە هەوڵ دەدات باشتر حاڵی ببێت و قوڵ تر فێر بیت کاری حزبو ڕێکخراو پێکیش دەبیت، هەروا بێت، ئەگەر پێوانە خێر و شەرە نابێـت کەم و زۆری تەمەن و هەواداری دەور ببینێت، ئەگەر وەك وتمان شایەد بەهۆی تاقی کردنەوەی زۆرترەوە هەر کۆنەکان باشتر بن، بەڵام ئەمە یاسایەکی بڕاوەو هەمیشەیی نی یە.

لە ئەنجامدا دەگەینە ئەم مەسەلەیە کەاولی الامر- کـە فـەرمانێکی قورئـانی یـە باشـترین ئـامێرە بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـار، اولی الامـر- ئـەوە نـی یـە کـە دەسـەڵات و حوکمڕانیـان بەدەسـتەوە بێت، نـەخێر، بـەڵکو ئەوەیـە کـە توانـاو برستی بەڕێوەبردنی‌امری هەیە ئەگەر چی ئەو کەسە نەناسراو بێت یـان لـە گۆشەیەکی زیندانێکدا توند کرا بێت.

-امـر- دەبێـت بسـپێرێت بـەاولی الامـر- هـەر وەکـو مەسـەلەی سـەعات و ئەسپەکە کە دەبێت بسپێرێت بە سەعات چی و بـەیتال، لەوانەیـە ئـەو کەسـە لاوێك بێت و تازە کار بێت بەڵام زۆر لەو خاوەن ڕابردوە باشتر تێ ی بگات.

★ ★ ★

پرسیار ٩/ ئایا بونی دوو کۆمەڵ و دەسـتە بـە نـاوی خـەباتی اسلامی یـەوە شتێکی ڕەوایە؟ ئایا کەس دەتوانێت ڕێگـەی کەسـی تـر بگرێـت، ئایـا بەرنامـەو بنەما لەم مەسەلەیەدا چۆنە؟

وەڵام/ هـەر لـە سـەرەتای ئـەم باسـەدا باسـێکم کـرد دەربـارەی ئـەوەوە کـە ئەگەر بەهەواو هەوەس کـار کـراو ڕێکخـراو و حـزب دروسـت کـرا، یـەکێك لـەو

شەڕانەی لەوانەیە پێش بێت ئەوەیە كە هەر خودی ئەو ڕێكخراوە توشی دووبەرەكی و ململانێ ببێت، ئەم مەسەلەیەش ئەگەڕێتەوه بۆ لای ئەو شتە وا پێم وتی، ئەگەر مەبەستت دەوێت بە پوختی و لە ئەندازەیەكی ڕێك و پێك دا، لەسەرانسەری دنیا و لەدنیای اسلامدا نابێت دوو جولانەوە هەبێت، بەلام واقع بۆتە هۆی پەیدا بونی ئەم جولانەوە جۆراو جۆرانە، هۆكانیش بڕێكی سیاسی و جغرافی یە.

ئەوانە وا پێشەوای جولانەوەیەكی دینین خەتایەكیان تێدا نەبوە هەروەكو جیایی مەزهەبەكان بڕێك سوننین و بڕێك شیعەن، شیعە ئەو سێ بەشە و سنی ئەو چوار بەشەیە كەماونەتەوە، ئێمە لە بەرامبەر ئەمەوە هیچ گوناهێكمان نی یە بەلام تكلیفێكمان هەیە بریتی یە لەوەی كە هەمو ئەوانەی پێچەوانەی ڕێ ی خودان ڕاست بێتەوە، هەر كەسێك جولانەوەیەكی اسلامی دێنێتە كایەوە بۆ ئەوەی هەمویان بهێنێتەوە سەر ڕێگا ڕاستەكەی اسلام، نابار و خراپەكان لەناو ببات، دوو نابار و خراپ كە دەیناسین تفرق مذهبی و جغرافی.

ئەگەر ئەمە بزانین و هەست بە لێپرسراوی بكەین ئیدی گوناهی جودایی جۆراو جۆر بەسەرمانەوە نامێنێت بەلام هەرگیز نابێت ڕازی بین بەم جیایی یە و گوێ نەدەین پێ ی، رضا بەخلاف گوناهە، وەك ئەوە وایە كە توشی گوناهەكە دەبێت یا شبیهە بەو. ڕەزای نا منطقی (ڕەزای ناچاری).

ئەگەر وابێت سنوری پێویست ئەوەیە وا وتم، واتە ئەو جولانەوانە هەرگیز ڕازی نەبن بەو جیایی یە، لەسەرانسەری دنیادا، هەولی بۆ بدەن و بە ئەركی خۆیانی بزانن كە ئەو جیایی یە لەناو ببەن، ئەگەر بەدڵ ئاوا بن گوناهیان نی یەو ڕۆژگار دروستی كردوەو ئەمان بەدڵ پێ ی ڕازی نین وە پێ یان خۆشە هەمویان یەك بن.

لە ولاتێكدا وەك ایران یان عیراق یان سعودیە یان بلێین كوردستان، ئەركەكانمان سەنگینتر دەبێت، ئەگەر وایە كە تەواوی جولانەوەی اسلامی لە

هەمو گۆشەیەکی دنیا دەبێت یەك بن ئەرکم لە کوردستان لەم بارەیەوە چەند بەرامبەرەو زۆر زیاترە.

ئەگەر لە ولاتێکدا کە رێگری سیاسی و جغرافی، حکومەتی نیە (بۆیەك بون) و جولانەوەی جیا جیا هەبێت و هەریەك بە جۆرێك کار بکات و هەوادارانی ئەم خەتە جیاجیانە پێ ی رازی بن: بە خوای متعال ئەوانە کلۆڵ و بەد بەختن و عاقیبەت شەڕن و سەر ئەنجام بە دەستی خاڵی دەچنە دیوانی خوا، هەر چەند نوێژو رۆژویان پتەوتر و زۆرتر بێت، بەلام ئەگەر بە دڵ نارازی بن و پێ یان ناخۆش بێت و بەکردەوەش کاری بۆ بکەن، بەسنگ فراوانی وبەو پەڕی رێزەوە بە﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ واتە دو قۆناغ، قۆناغی سێ هەم پەنا بەخودا ئەگەر جدال بالتی هی احسن، ئەگەر ئەم سێ قۆناغەمان بڕی و بەم شێوەیە کارمان کرد و جیایی و چەند بەرەکی هەر مایەوە ئیتر گوناهبار نین و شەرمەزاری لای خودا نابین.

★ ★ ★

پرسیار ١٠/ هەندێ جار ناکۆکی موسڵمانان لە ولاتێکدا دەگاتە رادەیەك تەواو دژی یەك دەوەستن، ئایا ئێمە دەبێت کێمان خۆش بوێت و رقمان لە کێ بێت؟

وەلام/ پەیوەندی نێوان موسڵمانان لە هەردو لایەنی ڕواڵەت و دەرونەوە لەگەڵ یەکتردا خوا لە ژێر ناوی-إخوة-[١٥] جێ ی کردۆتەوە، موسڵمانان دەبێت هەمو برای یەك بن، لە نامەیەکدا لە بارەی- السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين- کەمێك باسم کردوە، پەنا بەخوا ئەگەر من لە نوێژدا ئەمە بڵێم و هەر کەسێك کە بەندەی صالحی خودایە پێم خۆش نەبێت سلامو برکات و رەحمەتی خوای لەسەر بێت، وە هەروەها لە سەلامی کۆتایی نوێژدا کە دەڵێم- السلام عليكم ورحمه الله وبركاته- وبەدڵ وانەبم، یان هیچ وپوچ دەیڵێم یان مونافیقی (قەولی و فیعلی) دەکەم و درۆ دەکەم لەگەڵ خوادا.

پەنا بەخودا ئەگەر بڵێم –السلام علینا وعلى عباد الله الصالحین- بەڵام جگە لە فلان کەس لەبەر ئەوەی ئەو کۆمەڵ و خەتێکی ترە و ڕای وەك مـن نـی یـە، ئەی قوربەسەر نوێژ و کۆتایی هێنانی نوێژەکەم.

ئێمە پێویستە لەگەڵ خوادا ڕاست بکەین، زمـان و دڵمـان پـاك بێـت کاتێـك داوا دەکەین خوا سەلام بنێرێت بۆ بەندە باشەکانی، ئایا تۆ پێت وا نـی یـە لـە فلانە دەستەو خەتدا زۆر لەتۆ صالح تر هەبێت؟

ئەگـەر وا ئـەزانیت نـی یـە، خۆپەرسـتیت، خـۆت بەباشـترو صـالح تـر ئەزانیت(زانینی فلانە زانست و مەسەلە: نا) صـالح تـر و باشـتر(ڕەنگە کەسێك شتێك لە خەڵکی تـر زیـاتر بزانێـت بـەڵام بەمـە نابێتـە صالح)، تەفسیری ئـەم مەسەلەیە بە درێژی لە نامەیەکدا هاتوە، هاوار بۆ ئەو کەسانەی داعیەی دینـی بـن پێشەوایی خەڵك بگرنـە ئەسـتۆ بـەرەو دیـن، کەچی بـەگیان و دڵ دوعـای خێر نەکەن بۆ فلانە مۆمن لەبەر ئەوەی لە خەت و دەسـتەی ئەمـدا نـی یـە و لەڕاستیشدا دڵ ونیەتی خزمەتی ڕێ ی خودایە، بەڕاستی ئەگەر بـە دڵ دوعـای خێـر بـۆ خـۆم دەکـەم و بـۆ ئـەوی نەکـەم، بـەدڵ بـرا نـەبم لەگەڵیدا و خۆشـم نەوێت و حەز بەسەرکەوتنی نەکەم، بە ڕاستی بۆ خودام نی یـە و بـۆ خودمـە، ئەمەوێت من شتێك بم، بێ گوێدان و بەدەر لە هەرچی بەد نـاوی یـە بـۆ دینـی خوا پێش دێت و هەرچەند خەڵك توشی هەڵە بێت.

جا خوا هەمومان (ئەگـەر بـەلاوازیش بێـت) لـە گۆشـەیەکی دڵمانـدا نیـەتی خزمەتی خەڵکی خودا هەیە و پێمان خۆشـە خـوا لێمـان ڕازی بێـت، لـە شـەڕی ئەم هەڵەو گوناهە بمانپارێزێت و بە دڵ بڵێن امین.

پرسـیار ١١/ ئـەرکمان دەربـارەی ژیـانی پێغەمبـەران( ﷺ) چـۆنە و ئایـا حوججەت بونیان بۆ ئێمـە لـە چ رادەیەکدایـە، ئایـا مەسـەلەی فـەرمان ڕەوایـی داود و سلێمان(عليه السلام) چۆنە؟

وەرگرتنـــی وەزارەتـــی دارایـــی لەلایـــەن یوســـفەوە(عليه السلام) لـــە حکومـــەتی فرعەونێکدا بەچ شێوەیەك بوە؟

ئەمە بۆتە بەڵگە بەدەست زۆر كەسەوە كە بۆ خزمەتی خەڵك، موسڵمانێك دەتوانێت وەزارەتێك وەربگرێت لە حكومەتی پیاوێكی زاڵمدا ئایا سنوری ئەم مەسەلەیە چۆنە؟

وەڵام/ هەر لە باسەكانی پێشودا چەند ئاماژەیەكمان كردوە بۆ ئەم دوو مەسەلەیە هەر وەك وتم هەر ئومەتێك لەبەر ئەوەی هەڵ و مەرجیان جۆراو جۆرە دەبێت پیادە كردنە كەشی جۆراو جۆر بێت، بەڵام هەمان ڕێباز كە قورئان دیاری كردوە و پێغەمبەر( ﷺ) بەیانی كردوە، لەبەر ئەوەی سەردەمی جۆراو جۆر بوە و یەك شێوە نەبوە، ئەگەر پێگەیشتنی مرۆڤ گەیشتبایە ئەو قۆناغەی بتوانێت وحی بپارێزێت(واتە گەشەی سروشتی مرۆڤ وا بوایە كە بتوانێت وحی بپارێزێت ئیتر پێویستی نەدەكرد پێغەمبەرانی جۆراو جۆر بنێرێت)[١٦]. كاتێك قورئان هات مرۆڤ گەیشتبوە قۆناغێك لە گەشەی سروشتی دا (هەرچەند لە جاهلیەتدا بوەو رشدەكەی پەروەردەیی نەبوە) بۆ نمونە وەك لاوێكی پێگەیشتو كە چۆن بتوانێت ماڵی خۆی توند بگرێت و لێی داگیر نەكرێت، مرۆڤ گەیشتبوە ئەو قۆناغەی كە قورئان رابگرێت هەر چەند نەفام و بێ دەركیش بێت، وردە وردە فێری خوێندن و نوسین بوە، باشتر توانیان بیپارێزن و رایبگرن هەر وەك كردیان و گەیاندیانە ئێمە، ئەگەر جیاوازی سەردەم و جێگا نەبوایە خوا هەر یەكەم جار بە ئادەمدا (ﷺ) قورئانی ئەنارد و مرۆڤی وا لێدەكرد بیپارێزێت، نەخێر خوا سیستەمی دنیای لەسەر تدریج داناوە، هەمو شت بە تدریج دەروات بەرەو كەمال، خوا بكات لەم سیستەمەدا ئێمە بەجێ نەمێنین بەو جۆرە وا شایستەی مرۆڤبونمانە بەرەو كەمال بڕۆین تا كۆتایی.

ناردنی پێغەمبەران و شێوە ڕێگەی دابین كردن و پیادە كردنیان هەروا بوە. لەبارەی داود و سلیمانەوە(ﷺ) وەڵامت بدەمەوە، ئەم دوانە دەسەڵاتێكی وەك دەسەڵاتی باقی فەرمان ڕەوا و زۆردارانیان هەبوە بەو دەسەڵات و توانا مادی یە وە تا بتوانن ئەو كۆمەڵە نوقم بوەی دنیا گەری و پلەو ناوبانگە ببەن

بەرێوە، لەسەردەمی سلێمان دا(عليه السلام) گەیشتە كەماڵ، نـەك هـەر لـە دەسـەڵاتی دنیایی بەڵكو خوا-جن-یشی خستە ژێر دەسەڵاتی یەوە تا بتوانن ئەو كارە سـەر سورهێنەرانەی بۆ ئەنجام بدەن،ئەو سەردەمە پێویستی بـەوە بـو وە دەبوایـە وا بوایە.

دەربارەی یوسف(عليه السلام) لە باسی پەرلەمانـدا ئاماژەیـەكم كـرد بـۆ ئەمـە و تـا ئەندازەیەك ئەم مەسەلەیە رۆشن دەكاتەوە سەرباری ئەوە شتێكی تـریش زیـاد بكەم، بێ توانایی و بێ دەسەڵاتی حكومەتی میسر و بە ویستی خوا حاڵی بونی یوسف(عليه السلام) لەو خەوەو بەیان كردنی بۆ شا، كارێكی كرد كە هەمویان پێ یـان وابو هیچ چارەیەكیان نی یە جگە لەوەی سمع و طاعـەی تـەواویان هـەبێت بـۆ یوسـف(عليه السلام) (سمـع و طـاعەیـەك كـە شایستـەی أمتیـك لـە پێغەمبـەری ببێـت، ئەوان بێ ئەوەی لەسەر رێگەی خوا بن سمع و طاعەیان بو بۆ ئەو)[١٧].

واتـە وانـە بـو كـە دژی دیـن بـن وە هـەروەها وەك وتمـان لـە بەرامبـەر یوسفەوە(عليه السلام) (سمع و طاعە)یان هەبو، ئەگەر وابو زۆر لەوە دەچێت كە كـابرا وابزانێـت ئەمـە توێـژاڵێكی جاهلیەتـە بەسـەر كۆمەڵەكەیـەوە ئەگـەر بـرواتـە پەرلـەمان بەمـەرجێك هەقیقـەتی دیـن-نەشـارێتەوە قەیـدی نـی یـە و مـاوەی هەیـە، سـەردەمی یوسـف(عليه السلام) زەمینـەی ئـەم كـارە بـوە، مـن لـە روی ئـەم تەفسیـرانەوە وەڵام دەدەمـەوە، خـۆ اعـاذن الله لـە روی عـەقڵی بـێ بـڕو خـاوی خۆمەوە وەڵام نادەمەوە، لەوانە ئەكۆڵمەوە و تاو وتوێـیان دەكـەم و حـاڵی دەبم كە دەبێت احكام چۆن بێت.

★ ★ ★

پرسیار ١٢/ كەسانێك پێ یان وایە تۆ بـەهۆی ئـەم چـەند سـاڵە دوریـەت لـە خەڵك و لە زیندان بونت توشی گۆشەگیری بویت و وازت لە كـاری كۆمەڵایـەتی هێناوەو خەڵكت وێڵ كردوە؟

وەڵام/ بەشێکی  لە ناوەرۆکدا دروستە و ڕاستە و بەشێکی دروست نی یە، لە پێشەوە لە خوا داواکارم کە هیچ کاتێك ئاواتی خۆشبەختی مرۆڤ و بە تایبەتی امتی اسلام لە دڵما خاونەبێتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ پتەوترو خاوێن تر هەوڵ بدەم دین بگەیەنم بە بەندەکانی خوا. بەڵام ئەم مەسەلەیە دوو لقی هەیە کە یەکێکیان کاری سیاسی یە و لەبەردا باسمان کردکە ئێمە پێنەگەیشتبوین بۆ کاری سیاسی(کاری سیاسی ئەو جۆرە ڕێکخراو و بەزم و بازارەی دەوێت کە سەر ئەنجامەکەی دەبێتە طاغوت سازی).

بەڵام بارو زروفێك هاتە پێشەوە ناچار بوین بەشداری بکەین بە حوکمی- کارێکی ثانوی- نەك سەرەکی، ئەگەر کاری زیندان روی نەدایە و ئەگەر خوا هیدایەتی بدامایە رەنگە زوتر لەکاری سیاسی پاشەکشەمان بکردایە(لە کاری سیاسی نەك باسی سیاسی کە باسی سیاسی هەر کەس لە سنوری توانا و ئەرکی خۆیدا دەتوانێت باس بکات) کاری سیاسی هەروەك لەمەو پێش باسمان کرد سەرئەنجامەکەی طاغوت سازی یە، دوای ٧-٨ ساڵ دوریم لە هاورێ کانم لە دیدارەکاندا حاڵیم بو شتی وایان تێدا دروست بوەو خەریکی دەستە و دەستە سازین لە بەرامبەر یەکترەوە و خەریکی ململانێ و ناکۆکین، هەر چەند الحمدالله ئێستا باشتر بون بەڵام-اخوە-اسلامی بە هۆی کەم کوری ئەو ماوەیە تا ئێستاش دانەمەزراوە لە نێوانیاندا جا خوا هەمومان هیدایەت بکات بکۆشین ببینە برایەکی دینی نەك ئەندامێکی حزب کە ئەوە ئافەتەکانێتی.

لقی یەکەم:- بەڵێ من لە کاری سیاسی پاشەکشەم کردوە(ئەگەر زیندان نەکرامایە زۆر زو نیازم بو ئەو کارە بکەم) لە ڕاستیدا ئێمە ئەو کارەمان تەنیا بە ناونیشانی کارێکی سانەوی و ئەرکێکی لاوەکی ئەنجام دا(بەشداری کردنی لە ساڵی ١٩٧٩ دا، من ئێستا دڵنیا نیم کە خۆم و هاورێکانم گەیشتبینە ڕادەیەك کە بتوانین یەك گەرەك بە-قسط-ی اسلامی وە بەرێوە بەرین (واتە لە روی

معنوی‌و مادی یەوە بەرزی و نزمی لە نێوان خەڵکدا نـەبێت). مـن چـۆن رێگـە دەدەم هەواو هەوەس هاوەڵانم بکێشێت بەرەو ئەو جۆرە کارانە؟

لـە کاتێکـدا کـە پـێم خۆشـە مایـەی خێـر بـن و موسـلمانانە بـژین و بمـرن، لەبەر ئەوەی دڵنیام ناتوانین-اقامەی قسط- بکەین رێگا نادەم ئەم کارە بکـەن و بێ تەقوا بن و خۆم و ئەوانیش رسوای دیوانی خوا و پێغەمبەر( ﷺ) بین.

بەڵام مەسەلەی دووەم کە زیندان بۆتە هۆی ئەوەی کـە بـرۆم بـەرەو دەرون و کۆمەڵ وێـڵ بکـەم، ئـەم رسـتەیە زۆر کامـڵ نـی یـە، بـەڵام شـتێك هەیـە لـەم مەسەلەیەدا کە دروستە، من دوو جار کەوتومەتە زیندان جارێك لە حکومـەتی شـادا و جارێـك لـە حکومـەتی اسـلامی دا، وێـرای لاوازی و بـێ توانـایی خـۆم هەردوو جارەکە بۆتە مایەی خێر بۆم الحمد الله، پێش ساڵی ١٩٦٣ لەبەر ئـەوەی زۆر شپرزو بـێ بەرنامـە بـوم و هـەوڵ و کۆششـم بـێ سـەرو بـەر بـو، هـەروەها هەڵەم زۆر بو، لە زینداندا راچلەکیم و بە هەڵەکانی خۆم زانـی و رێـك و پێـك تـر هاتمـە مەیـدان، بـەڵام لـەم زیندانـەدا شـتێکی تـرم دەرك کـرد کـە ئەوەنـدە کۆتـەڵ نـەبو بـوم تـا جـوان پـەی بـەو شـتە بـەرم و پیـادەی بکـەم، بـەکورتی و سادەیی لە مێژوی دیندا سێ دەستە بـون کـە هەردەسـتەیەکیان پـێ یـان وا بـوە کاری خۆیان دروستە(خوا لە مخلصەکانیان خۆش بێت).

١-عارفەکان-عرفاء

٢-زاناکان-علماء

٣- سەرانی تەکیەو خانەقا- متصوفە -

(خـوا پلـەی مخلصـەکان بـەرزتر بکـات و گوناهکارەکانیـان ببەخشـێت و زیندوەکانیان هیدایەت بکات). نەخێر رێگای محمد( ﷺ) رێگای هیچ یەك لەم سیانە نەبوە و ئەمانە هەڵەو خەتاشیان زۆرە، رێ ی محمد( ﷺ) بـرواو چاکی ئـەم سـێ دەسـتەیە لەگـەڵ شـتێکی تـر کـە ئـەویش-جیهـادێکی بەردەوامـە بـۆ لەناوبردنی باطل-گەورەو بچوك- بۆ دامەزرانـدنی دینـی خـوا کـە هـیچ کامیـان

ئەو جیهادەیان(بە تێرو تەسەلی و درێژخایەن و قوربانی دنی مـاڵ و نەفسـەوە نەبوە.

مـن هەڵەیـەکی گـەورەم کـرد کـە سـتایش بـۆ خـوا راسـتم کـردەوە و زانـیم، ئەوەی ئێستا دەتـوانم بـە کورتی و سـادەیی خـۆم و هـاوەڵانم حـاڵی بکـەم لێ ی ئەوەیە:-

کاری دینی بەکورتی دوو بەشە:

١-تزکیە.

٢- دەعوەت.

١- تزکیە:- بۆ پەروەردەکردن و تزکیەی ڕابەرو ژمارەیەکی کەم لە پەیڕەوان کە ئەرکێکی قورس دەکەوێتە سەر شانیان کە دەبێت جیهاد بکـەن و هیدایـەتی خەڵکی بکەن ورۆشنیان بکەنەوە.

٢- دەعوەت:- بۆ گشت موسڵمان و غەیرە موسڵمان.

ئەمە روح و ناوەرۆکی مەسەلەکەیە، بـەڵام هەڵـەی مـن چـی بـو کـە خۆشـم دەمزانی و دەرەقەتی نەدەهاتم؟.

لە زۆر جێگەدا رونم کردۆتەوە کە مرۆڤ بریتی یـە لـە دوو لایـەنی-ظـاهر و باطن- رواڵەت و دەرون، دەرونی مـرۆڤ زۆر فراوانـە بـەڵام سێ لقـی گـەورەی لێ جیادەبێتەوە.

١-ذهن -هۆش-

٢- قلب -دڵ-

٣- نفس –لایەنە مادی یەکەی مرۆڤ-لەش-

نفس کاری سادەو ئاسانە، ئەمەش هەر نیعمەتی خودایە کـە هەسـت کردنـە بەبرسێتی و خەوو پشودان کە ئەمـەش لە پێداویستیـەکانی بـەردەوامی ژیـان و زاو زێ یە.

گـرنگتر لـە دەزگـای نفـس دەزگاکـانی قلـب و ذهنـە- بەتایبـەتی دەزگـای قلبە(ئێستا لێرەدا باسی پەیوەندی ئەمانە لەگەڵ لەشدا ناکەین) کاری کەماڵ و پێگەیشتنی مرۆڤ وا پێویست دەکات هەم دەزگای ذهن بخەینە گەڕ هەم دەزگای دڵ، بـەڵام لـە ڕێ ی –ذهنـەوە بصـیرەتی پـێ بـدەیت و بیخەیتەگـەر، تـەنیا پەروەردەیە کە پەیوەندی لەگەڵ –قلب- دایە فێربون و زانین پەیوەستە بـە – ذهنەوە، بەڵام وەك وتم پەروەردە کردن لە ڕێ ی فێربونەوەیە.

لە ڕابردودا دەمزانی کە دەبێت مرۆڤ بکرێتە مرۆڤ، نەك بکرێتە هەنبانەی زانست، بەزانین دەردی مرۆڤ چارە ناکرێت(ئەگەر جوان سەرنج بـدەیت هـەمو دەردەکان هەر لە زانایانە) وەك لە شیعرێکدا وتراوە – هەر هێڵێ کە لارە هـەر لە زانایانە، زانایانی زانستە جۆراو جۆرەکان.

کێ یە بۆمبی ئەتۆم و هەمو مادە ژەهراوی یەکانی تر دروست دەکەن؟

کێ یە زۆرداری دەکات؟

ئەوانە خەڵك نین، خەڵکی ڕەمەکی دەبنە دار دەست(هەڵبەتە زۆر زانا هەن کـە هـەرگیز ئامـادەی خراپـە نـین و تەمـەنیان بـەخت دەکـەن بـۆ خزمـەتی مرۆڤایەتی).

بـەڵام کاتێـك باسـی دەردەکـانی مـرۆڤ دەکـەین لـە نێـوان زانایـان و خـەڵکی ڕەشۆکی دا، سەیر دەکەیت بەد بەختی یەکانی مرۆڤ هەر لە زانایانە.

دەمزانی کە کاری دینی، کاری پێغەمبەران وەك دەستەی علماء نی یە زانـین بە بنەما بزانم و هەوڵ بدەم زانینی کەسێك زیـاد بکەم(ئەمـە مانـای ئـەوە نـی یە کە علماء بایەخیان بە پەروەردە کردن نـەداوە بـەڵام ئـەو دەسـتەیە زۆر تـر علم گەریان کردوە، عرفاءزۆرتـر قلب گـەری یـان کـردوە و صـۆفی یـەکان زۆرتـر کاری عەمەلی گەری لەشیان کردوە. (خوا لە مخلصەکان رازی بێت).

بـەڵام ئەمـە کـاری دیـن نـی یـە بەتـەنیا، تەنانـەت ئەگـەر چاوپۆشـی لـە هەڵـەکانیان بکـەین ئێسـتا ئـەم ڕێ بچـوکانە ڕێ ی دیـن نـی یـە هـەر چـەند

دەمزانی ئەگەر مرۆڤ دەخەیتە ڕێ، بەرەو لای خوا بە هەردوو دەزگای —ذهن و قلب- وە بیخەیتە رێ ی، وە بایەخی گەورە بدەیت بە پەروەردەکردنەکەی- قلب- یانی چی؟ واتە ئەوەندە-ذهن- ی بکرێتەوە کە —قلب-ی هاوشێوە بێت لەگەڵیدا، بۆ نمونە پێ ی دەڵێیت(لااله الا الله) —ذهن-ی پڕ دەکەیت و تێدەگات، -قلب- یشی ئەو توانایەی پەیدا کرد بێت کە مل کەچ نەکات بۆ غەیری خوا، قلبی ئەو توانایەی پەیدا کردبێت بۆ ماڵی دونیا و پلە و ناوبانگ لە فەرمانی خوا لانەدات، ئەمە هەر لە قۆناغی یەکەمدا کە وشەی یەکەم -لااله الا الله- یە وەختێك جوڵانەوەکەت دینی یەو دەتەوێت کەسێك فێری دین بکەیت، ئەبێت قلبی ئەو کەسەش هاورێ بکەیت لەگەڵ ئەو دینەدا، ئەو تواناو بڕستەو ئەو سۆزو هەستی الهی وئەو بێزاری یە لە غەیری خوا پەیدا بکات، بە هیچ نرخێك سەر دانەوێنێ بۆ فەرمانی غەیری خوا.

نەخۆم شایستە بوم(ناڵێم ئێستا هەم، نەخێر، زۆر لەو کاتە ناشایستە ترم) نە هاورێکانم(تا ئەندازەیەك دروستە، من لم یکن لنفسه کیف یکن لغیره).

ذات نا فتە از هستی بخش- کی تواند بشود هستی بخش.

نەم دەتوانی وپێم خۆش نەبو هاوەڵانم من بەشتێکی سەیر بزانن و پێ یان وابێت قسە هەر ئەوەیە من ئەیکەم، زۆر کات دەموت کاکە دەبینین من شتم لەبەر ئەوەیە کە وڵات شتی تیا نی یە —مەلا نەبو کەلەشێر ابولقاسمە.

نمونەی ئەو مامۆستایەم بۆ دەگێرانەوە کە نەیدەتوانی —ڕ- باش بلێت-ڕێ-، کاتێك دەرسی بە منداڵان دەوت، دەیوت بلێن دال، زال، ڵێ-(ڕێ) منداڵەکانیش وەك ئەو دەیانو ت: دال، زال، لێ (ڕێ)، مامۆستا دەیوت رۆڵە وەك من مەڵێن- لێ- وەك موسڵمانان بڵێن-ڵێ- منداڵان هەر —ڵێ —ی مامۆستایان دوبارە دەکردەوە، تا لە کۆتایی دا مامۆستا هەستی کرد دەرد لە خۆیەتی و خۆی نازانێت وشەی-ڕێ- باش-تلفظ- بکات.

زۆر جار پێم دەوتن بەخودا باش دەزانم دین چی یە و ئەبێت چۆن بم و چۆن پەروەردە بم و چۆن پەروەردەتان بکەم بەڵام وەك کابرا وتی ئاخ زۆرێکە بۆ ذاتێك.

(دەڵێن چەتەیەك فێربوبو لەسەر پردێك رێگری دەکرد و خەڵکی ڕوت دەکردەوە ڕۆژێك کاروانچی یەك بە ئێسترێکەوە هات و هەرچی کرد ئێسترەکە لە ئاوەکە دەترسا و نەدەپەڕی یەوە، بارەکەی داگرت ودای بەسەر شانیدا و هێنایە ئەم بەرەوە(باری ئێسترێك زۆر قورسە و بەکەسێك جێ بەجێ ناکرێت) پاشان دەنگی کرد لە وڵاخەکە، بەڵام وڵاخەکە دەترسا و نەدەهات ئێسترەکەشی دا بە کۆڵیداو لە پردەکە پەڕاندیەوە، کابرای دز کاتێك چاوی بەمە کەوت زۆر ترسا و خۆی مات و بێدەنگ کرد و لە دڵی خۆیدا وتی ئەم کابرایە پێم بزانێت پارچە پارچەم دەکات، لەم کاتەدا کاروانچی بەو پەڕی تاسە و ئاخەوە وتی ئاخ زۆرەکە بۆ ذاتێك، ئیتر دزەکە زانی کە ئەم کابرایە هەزۆرە و غیرەتی نی یە هەر هەیکەلە وقلبی نی یە لە گەڵیدا، (غیرەت-ذات- بەشێکە لە هێزەکانی-دڵ-) بەم شێوەیە کابرای روتکردەوە).

زۆر جار ئەمەم دەگێرایەوە بۆ هاوەڵانم و دەموت دەردی من دەردی کابرای کاروانی یە ئاخ زۆرە کە بۆ ذاتێك، دەزانم ئەبێت چۆن بم ئەمانە چۆن پەروەردە بکەم بەڵام شایستەگیم نی یە، دڵە خوێریەکەم پەروەردە نەبوە و هاورێ نی یە لەگەڵ زانینەکەمدا - بەذهن- تێ دەگەم بەلام-دڵم- توانای نی یە.

الحمدالله ئەم زیندانە پێش هات و زانیم کە ڕێگای هەیە و دەکرێت ئەنجام بدرێت-عەمەل بکرێت- دڵ- قلب- لەگەڵ —هۆش-ذهن- دا هاورێ بکرێت و-قلب- و ذهنمان- هاورێ بن، بەڵام چۆن ئەم کارە بکەم؟

زانیم کە کردەوە-اعمال- کاری سیاسی و زۆربەی کارو چالاکیەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە، لە زۆر وتن و بێ هودە وتن کە زیاتر-ذهن- پڕ دەکات وە خۆم و

ئەوانیش بپارێزم، زۆرتر بەم شێوەیە کاربکەم شتی وابلێم کە لەذهن- وە ڕاست بدا لەقلب- بە نومێد و ئیزنی خوا — دڵەکانمان- زیندو بێتەوە.

جیاوازی کاری ئێستام لەگەڵ رابردو ئەمەیە، گۆشەگیری و (انزوا) نی یە و دابران لە کۆمەڵ نی یە، خوا نەیکا من لە خەڵك دابـبڕێم، زۆر جار لەنامەو شیعرەکانی ئەم دوایی یەدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردوە کەانزوا- گۆشەگیری چەند پێچەوانەی ڕێ ی خودایە(هەر چەندە زۆر عارفی خوێن شیرین وایان زانیوە کەانزوا- گۆشەنیشینی و پەروەردەکردنی-خۆ- بنەمایە و ئیدی کاریان بەخەڵکەوە نەبێت).

بەڵام هاوەڵانم باش حاڵی کردوە بنەما ئەمە نی یە، نەخێر ئێستا کارم دامەنگیرتر و فراوانت و کۆك تر بوە(جامع تر بوە) جاران هەر خەریك بوم- ذهنی- خەڵك پەروەردە بکەم بەلام ئێستا بە هیدایەت و اخلاص و توفیقی خودا بە هیوام-انسان مؤمن- پەروەردە بکەم نەك —انسانی زانا-.

بەشێوەیەك پەروەردە بن، کە جوتبن لەگەڵ زانینەکەیان، بە ڕەوشت و ئاوات ئارەزو و عەمەل- انسان مؤمن- واتە ئەمە.

داوای یارمەتی و هاوکاری خوای متعال دەکەم بۆ هەمومان، بۆ ئەوەی هەمو ئەوانەی خەریکی هیدایەتی بەندەکانی خودان، خوایە یەکەم جار هیدایەتمان بکە و ئاشنامان بکە بە ڕێگاکەت پاشان اخلاصمان پێ بدە لە بەرامبەر هەواو هەوەسەوە پاشان توفیقمان پێ ببەخشە خوایە بمانپارێزە لەو توفیق و سەرکەوتنەی وا لە ڕێ ی تۆ دورمان دەخاتەوە خوایە صەلاوات سەلام و ڕەحمەتی خۆت بنێرە بۆ هەمو پێغەمبەران و دوا پێغەمبەرت محمد(ﷺ) — وە بۆ هەمو دڵسۆزان و پیشەوایانی پاك کە ئاواتی ڕێنمایی خەڵکیان هەیە.

★ ★ ★

پرسیار ١٣/ دوا پرسیارمان لە بەڕێزتان ئەم باسەیە، من زۆر جار بیستومە کە باسی نوسەرێکت کردوە کە زۆر ناسراو نەبوە، بەو پەڕی ڕێزەوە ناوت

بـردووە و باسـی کارەکـەیت کـردوە بـۆ نمونـە وەك مامۆسـتا جـلال رفیعـی کـە لێکۆلینەوەیەکی کردوە لەسەر-انفاق- ڕیشەی وشەکەی دۆزیوەتـەوە و لـە مانـا لغوی یەکەوە چوە بۆ مانـا و نـاوەڕۆکی وشـەکە و بـەکار هێنانـە قورئانیەکـەی، بەلام کەمتر ڕێك کەوتوە یان پێویستی نەکردوە باسی گـەورە مامۆسـتا و کەڵـە موسڵمانێکی وەك سید قطب یـان امـام مـودودی یـان علامـە نـدویی یـان (امـام بـەننا)ت کردبێـت، ئەمـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی کەسـانێك وا هەسـت بکـەن کـە خوانەخواستە تۆ لەبەر چ شتێکی نفسانی و دنیـایی باسـی ئـەم پیـاوە گەورانـە ناکەیت یان لەوانەیە لە خۆت کەم بێتەوە، یان تەنانەت کەسانێك وا دەزانن کە تۆ ئاشنا نیت لەگەڵ بەرهـەمی ئـەم مامۆسـتایانە بـۆ نمونـە في ظـلال القرانـت نەدیبێت، باسە فکریە قوڵەکانی مودودی نەناسیت، بەرهەمی ندویت نـەدیبێت چـالاکی و جولانــەوەی امــام بنــا نەناسـیت، تکایــە ئــەم گومانــە لــە دڵــی ئــەو کەسانەدا مەهێڵە و لەم هەڵەیە رزگاریان بکە؟

وەڵام / پێشەکی عەرزت بکەم ئەم پرسیارە دیسان دوو لقی هەیە:-

یەکەم: ئەوەیە کـە زۆر جـار بـوە باسـی کەسـێکم کـردوە کـە کـارێکی کـەمی کردوە بەڵام پێش نـەهاتوە باسـی ئـەم زانـا دینیانـە بکـەم وا هـەولیان داوە کـە دینی خوا ڕون بکەنەوە بۆ بەندەکانی خوا کە ئاسمان تـا زەوی جیـاوازی هەیـە لە نێوان کارو چاڵاکی ئەم پیاوانەو باقی پیاوانی تر.

دووەم: ئەوەیە کە گوایە لـێ یـان بـێ خەبـەرم و خوێندنـەوەو توێژینـەوەی بەهەرمەکانیانم نەکردبێت.

بۆ وەڵامی لقی یەکەم خۆم تا ئێستا هەرگیز نەمزانیوە کە لـەو باسـانەدا وا کردومە یان نوسیومە ناوی ئەو پیاوانەم نـەهێنابێت خـوا پاداشـتی تـۆ و بـاقی موسڵمانانیش بداتەوە، بەڵام لە باسی ڕۆژانە و خۆیی دا بەو شێوەیە نەبوە، بۆ نمونە پێش ئێستا وتم کە زۆر جار بەهاورێکانم دەوت وەك من مەڵێن لـێ وەك موسڵمانان بڵێن لێ(ڕێ) یان پێم دەوتن شارێك پێشەوای تێدا نەبێت کەلەشێر ابولقاسمـە، بـۆ نمونـە لـەو سـەردەمەدا کـە حـاڵی بـوم پـەروەردەکردن پـێش

فێرکردنـە زۆر باسـم لـەم بارەیـەوە دەکـرد، بـە ڕێکـەوت لـەو کاتـەدا کتێبێکـی مامۆستا محمد قطب کەوتبوە بازاڕەوە کە عەرەبیەکەم نەدیبو بـە فارسـی بـەر دەستم کەوت بە ناوی –شێوازی پەروەردەکردن لە اسلامدا- بـڕێکم خوێنـدەوە گـەلێك شـیرین و بـەپێز بـو لـەلام، دیسان دووبـارەم کـردەوە کـە بـزانن کاتێـك دەڵێم ئەگەر پێشەوا نەبێت لە شارێکدا کەلەشێر ابولقاسمە مەبەستم ئەمەیـە، سـەرنج بـدەن هـەمو بـاس و لێکۆڵینـەوەی مـن لـەبارەی پـەروەردە کردنـەوە لەوانەیە سەعاتێك یان سەعات و نیوێك بـاس کـردن بێـت بـڕوانن ئـەم مرۆڤـە مەزنە چ شتێکی گەورە و بەبایەخی نوسیوە لە بارەی پەروەردەکردنی اسلامی وە.

لـە یـەکێك لـە شـیعرەکاندا ڕازو نیـازێکی دڵـی خۆمـە بۆخۆشەویسـتی خـوا محمد( ﷺ) (کە بۆچون و تێگەیشتن و پێگەیشتنی خۆمـە کـە لێـرەدا ناکرێـت باسـی لێـوە بکـەم)، سـێ چـوار دێـرە بـە عـەرەبی- رسـالەتی کـبری و رسـالەتی صغری- دێرێکیان ئاماژەیە کە بۆ شەخصیەتی گەورەی سید قطب و دعوەتێك کە لە سید کرا بۆ افطار یەك ڕۆژ پێش لە سێدارەدانی.

رسالتك الكبرى بلغت كمالها ولكن ترى (قطبا) هدى اكبر الفطر

کـەـتـری- بـەنکرە هـاتوە واتـە سـید قـطبێکـە بـۆ مرۆڤایـەتی نـەك بـەناوی کەسێك کـە سـید قطبـە، گـەورەتر لەمـە بـەـتـنکیر- کـە مەبەسـتم ئەوەیـە بـە پێشەوای مەزن بلێم – سید قطب رسالتی صغری- تۆیە.

دیسان لە کۆپلەیەکی تری فارسیدا کە دەستم ڕاکێشاوە بـۆ لای ئـەو باسـەی کـە بلێم(بـەم کـارە ڕێکخراوەیـی و حزبـی یانـە دڵخـۆش مەکـەن) نمونـەی کەسایەتی سـید قطـبم بـە نمونـە هێناوەتـەوە لـە دێـری یەکەمـدا نـاوەڕۆکی شیعرەکە ئەمەیە کە زۆر دڵشاد وە مەغروری حرکت و چالاکی کاری حزبانـەی کە دەیبینین مەبن و خۆتانی پێ فریو مەدەن و بەکاری زۆرەوە مەنازن.

بران قطبی ببايد غبطه بردن كه محبوبش فرخواند به افطار

ئەگەر بریار وایە ئاواتت بێت گەورە بیت بە چالاکی و زۆر جولان مەنازە و چاو ببرە لە سید قطب بەو شێوەیە گەورەیە کە خۆشەویستت بانگت بکات بۆ افطار.

ئـەم دوو سـێ نمونەیـەم بـاس کـرد بـۆ ئـەوەی بـزانن خـوا نەخواسـتە قـەدر نەزان نەبوم زانیومە کە ئەم کەسانە چەند بـەرزن چـەند پێشکەوتون وەمنـی بچوك چەند لەدوام نسبەت بەوان.

بـەلام بـۆ مەسـەلەی زۆر شـارەزا بـون و ناسـینی بەرهەمـەکانیان بـەلێ بـەم شێوەیە نەبوم و زۆر شارەزا نەبوم.

بە ئەندازەی ئەوەی کە شخصیەتیان بناسـم شـارەزا بـوم کـە ئەمانـە چـەند خۆشەویست و مەزنن بەلام بۆ زانینی بەرهەمەکانیان زۆر شارەزا نەبوم، بۆ؟

لەبـــەر ئـــەوەی دوای ســـالی ١٩٦٤- ١٣٤٣ — کـــە کەوتمـــە ســـەر ئـــەم خـــەت و بەرنامەیـە و پـێش ئەمـەش هـەر سـودم وەرگرتبـو لـە برێـك لـە —ائمـە هدی- دەورانی خۆمان، بەلام کەم و شپرزو بێ کاریگەر بو تەنیا هەر هەست و جۆش و خرۆشـێکی دینـی و شـیرینی جیهـاد بـو بـێ زانـین بـەلام دوای سالی ١٩٦٤ کـە کەوتمە سەر ئەم رێ یە بریارم دا، وەك لە پێشتردا باسـم کـرد کـەمێك رێـك و پێك ترو قولێ ترو هەمو لایەنە تر چالاکی اسلامی خۆم دەست پـێ کرد(بـەو هەلەو کەم کوریانەی کە لەو کاتەدا بوم) الحمد لله ئاشناییم پەیـدا کـرد لەگـەل ئەم پێشەوا گەورانە لە رێ ی نوسینەکانیانەوە.

خودا پلەیان بەرزتر بکات بەلام چ ئـەو کاتـە و چ ئێسـتاش لەبـەر مەشـغولی جۆراو جۆر نـەمتوانیوە کتێبەکانیان بخوێنمـەوە نـەك بـەناو نیشـانی-اسـتغناء (لـەم باسـەدا وتم کـە هـەر کەسـێك ئـاواتی هەیـەو دەیـەوێت هیدایـەتی خـەلك بکات نابێت تەنیا اجتهاداتی خۆی بەبەس بزانێت و پێویستە لـە راو بۆچـونی خەلکی تریش سود وەربگرێت ئەمە ئەرکی سەرشانی خۆشمە).

هەمو مەسەلە گرنگ و سەرەکی یەکانیان حالی بوم و اجتهادە گەورەکانیانم زانیوە و رۆحی رایـەکانیان بـۆ مـن گرنگـەو بەکـەلکم دێ پێویستم پـێ یـەتی

ئیتر ئەگەر هەمو درێژە باسەکان یان نەزانم زۆر گرنگ نی یە وبۆ حاڵی بون لەم ڕایە سەرەکی یانە هەوڵم داوە، خۆ باسەکانیان زۆر بایەخ دارەو بەکەڵکی هەمو کەس دێت بەڵام من کە گیر وگرفتم زۆرە و ماوەم نی یە هەمو شتەکانیان بخوێنمەوە زۆر گرنگ نی یە، ئەمە چوار چیوەی وەڵام و مەبەستی من بو.

بەڵام شتێکی تریشم هەیە کە من زۆر جار بۆچونی کەسێك بەلامەوە زۆر جوانە بەڵام ناتوانم ناوەکەی لەبەر بکەم لەبەر ئەوەی کە لایەنی لەبەر کردنم(حفظ) لاوازە و کەم تر باوەڕم بەخۆم هەیە لە بردنی ناوی خاوەنی ئەم ڕایەو لە ١٠٠٪ بیرم نی یە، زۆر پێش هاتوە شتێکم وتوە کە داوای ناوی کتێب یان نوسەرەکەیان کردوە و پێم وتون پاشان سەیریان کردوە نەخێر هەڵە بوە و لەو کتێبەدا نەبوە لە کتێبێکی تردایە ئەم لاوازی لەبەر کردنەم هەر هەبوە و ئێستاش کە پیر بوم زیاتر بوە.

سەردەمێك باسی ئەوەم زۆر دەکرد بۆ براو هاوڕێ یەکانم کە زۆر توند و تیژ مەبن بەرامبەر بەوانەی بیرو بۆچونی الحادیان هەیە چونکە واتێگەیەنراون و سەرەنجامی ئەم تێگەیشتنە هەلەیەیان ئەوەیە کە بێزاربن لە دین و مونکیری دین بن و مونکیری خوای خەلق، جێ ی سەرسوڕمان نی یە بۆ نمونە جارێك باسی نوسەرێکی انگلیزم بۆ کردن کە لە پێشەکی کتێبەکەیدا باسی ئەمە دەکات کە لە سەرەتاوە بۆچونی بەرامبەر بە اسلام زۆر خراپ بوە و پاشان گۆڕاوەو دوای ناسینی اسلام بۆچونێکی تری هەبوە[1]

هۆشم لە لایەنی-حفظ- وە بەم شێوەیە لاوازەو باوەڕی پێ ناکەم و کەمتر پەیوەندی نوسەر و بەرهەمەکەیم لەبیر دەمێنێت، تەنانەت زۆر جار وەك خۆت ئاماژەت کرد من کەمتر دەقی ئایەت و حدیث دەخوێنمەوە بەڵکو دەڵێم قورئان وا دەڵێتو حدیث وا دەڵێت بۆ؟

لەبەر ئەوەی ئەوەی گرنگە بەلای منەوە ئەوەیە كە مەبەستە سەرەكی یەكەی، نەك هەر حالی بكەم وە پێم وایە كە بۆ حالی كردن و گەیاندنی ناوەڕكەكە بۆ دلی، عبارەتەكە گرنگ نی یە بەلكو ڕۆحی مەبەستە كە گرنگە، بۆ زانا عبارات گرنگە كە خەریكی كاری زانستی یە نەك بۆ گشت خەلك، بەهەمان شێوە ناوی ئەو كەسانەش، مەگەر كاتێك بۆ ئەدای ئەمانەت پێویست بكات بوترێت، ئەگەر كەمتر باسیانم كردوە لەبەر ئەم هۆیانە بوە، خوا لێ یان ڕازی بێت لە هەمویان سودم وەرگرتوە و خوا بكات هەمو أمت لە بیرو باوەڕو اخلاصیان بەهرەمەندبین.

★ ★ ★

لە كۆتاییدا داوامان لە خوا ئەوەیە لێت رازی بێت و نوقمی بەرەكەت و رەحمەت و صەلەواتی خۆیت بكات وە دوعامان بۆ بكە طبقی بەرنامەی خوا كار بكەین و مخلص بین.

(كاك ئەحمەد):- خوایە كارو چالاكیمان بە شێوەیەك بێت كە لە كۆتاییدا بەرهەممان پوش و پەلاشێك نەبێت و خەرمانمان وەك ڕومان سوربێت.

خوا ئاگاداری هەمو موسلمانێكی مخلص بێت و هەمو ئەو كەسانەی بەدل خەلكیان خۆش دەوێت، تەنانەت ئەگەر موسلمانیش نەبێت و بەلام بە دل پێی خۆشە خزمەتی خەلك بكات و رزگاریان بكات خوا رەحمی پێ بكات و هیدایەتی بكات تا بەڕاستی كار بكات و باش بزانێت بیانخاتە سەر ڕێ ی خۆشبەختی و خوا پاداشتی زیاتر بكات و السلام.

كۆتایی

پەراوێزەكان

(١)- جاهلیەت واتە ئەو كۆمەڵگایەی كە بەرنامەو داب و فەرمان و یاسای لە دینی خوا وەرنەگرتوە، ئەمە سوكایەتی كردن نی یە بەڵكو راستی یەكە با هەر ئێستا ئاماژەیەك بكەم، جوتیارێك پێویستە برێك لە هونەرو زانستی كشتوكاڵ بزانێت واتە ناسینی زەوی و تۆو شێوبرین و جۆگە هەڵدانەوەو ئاو یاری كردن بزانێت و ئەنجامی بدات، ئەگەر كابرایەك زانایەك بێت لەهەمو بارێكەوە و پسپۆرێكی زانستی-فضا- بێت بەڵام لە كاری جوتیاری هیچ نەزانێت و دەست بەكاربێت ئەم كەسە-جاهیلە- كورتەی مەبەست بەسادەیی ئەوەیە كەسێك نیازی هەر كارێكی بێت دەبێت لێ ی بزانێت، تۆ ئەگەر سەعاتەكەت بشكێت نایبەیت بۆ-انشتاین- چاكی بكاتەوە بەڵكو دەیبەیت بۆ سەعات سازێك كە لەوانەیە ئەلف و بێ نەزانێت و بێ سەواد بێت.

ئوتومبێڵەكەت خراپ بێت نایبەیتە لای پیاوێكی پایەبەرز و زانای وەك محمد قطب و دكتۆر یوسف قرضاوی كە بۆت دروست بكەنەوە، دەیبەیتە لای كابرایەكی میكانیك كە لەوانەیە نەخوێندەوار بێت، هەر كێشەیەك دەگێرێتەوە بۆ لای ئەو كەسەی كارزان و پسپۆرە لەو كارەدا و لێ ی دەزانێت جازانست یان هەر شتێكی تر.

كە باسی ئێستای ئێمەی زانستی كاری بەرێوەبردنی مرۆڤایەتی یە ئاشكرایە زۆر گرنگ ترو گەورەتر لە تۆو كردنی چوار مەن گەنم و جۆ یان دروست كردنەوەی ئوتۆمۆبیل و سەعاتێك تۆ كە نیازتە كۆمەڵێك یان بەشێك لە كۆمەڵگای مرۆڤایەتی رزگار بكەیت دیارە كە دەبێت ئەو كەسە ئاگادار بكرێت بۆ ئەم كارە كە لێ ی دەزانێت، هیچ نەبێت بە ئەندازەی سەعاتەكەت و ئۆتۆمۆبێلەكەت بایەخ بدە بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

بە ئەندازەی زەویەكەت و چاندنی تۆێك نرخی پێ بدە، جگە لە خوا هەیە مرۆڤ بناسێت؟

درێـژەی نـادەینێ و زۆر سـادە دەکۆڵێنـەوە، مـرۆڤ وەك لایـەنی مـادی هەیـە لایەنی ڕۆحی و معنویشی هەیـە، تـا ئێستا لایەنـە مادیەکەی(لەشی، ڕواڵەتی) باش نەناسراوە، بۆ نمونە لە ناو ئـەو دە ملیـارد خانـەسێڵ- ی کە لـە مێشکی مرۆڤدا هەیـە زانسـت زۆر لـە ئێسـتا پێشکەوتو تـر بێـت ئەوسا لەوانەیـە کـە هەست بکـات و پـەی ببـات بـە ١٠٠ خانـە کـە کـارێکی تایبـەتی و ئەلاحـەدەیان هەیە.

بەشێکی کەم لە لایەنە مـادی یەکـەی مـرۆڤ، کـە ئاشکرایە و لەبـەر چاوە و لەتاقیگاکاندا دەبینـرێت ناسـراوە بـۆ مـرۆڤ بـۆ زانایـانی مـرۆڤ، وا فـەرز بکـەین ئەو زانایانە کە لـە زانسـتە مرۆڤی یەکانـدا- علـوم انسان-ی کاردەکـەن، دەرکـی کێشەکانی مرۆڤایەتیان کردبێت(تاك و کۆمەڵ) بەڵام کاتێك نەیانتوانیوە بـارو لایەنە مادی یەکـەی مـرۆڤ بـزانن، چۆن دەتـوانن بەرنامـە بـۆ مـرۆڤ دابنـێن و چارەسەری کێشە کانی بکەن؟

ئیتر کارم بەسەر لایەنی ڕۆحی و معنوی یەوە نی یە، لە ئەنجامـدا دەگەینـە ئەوەی کە ئەگەر مرۆڤـت سـپارد بـە مـرۆڤ بەرنامـەی بـۆ دابنێـت، لـە ڕاسـتیدا سپاردوتە بە نەزان-جاهل-.

هەمو زانـا و فەیلەسوف و مـرۆڤ ناسـەکانی مێـژو بێنـە هـەر لـە سـەردەمی ئادەمەوە(ﷺ) تا ئێستا تەنیا لەلایەنی مادی یەوە نەیانتوانیوە مـرۆڤ بناسـن، ئیتر بەسە و حەیفە مرۆڤ لە تراکتۆرێك و سەعاتێك کەمتر سەیر بکرێت.

بۆ نمونە ئەسپێکم هەبێت ئەگەر نەخۆش کـەوت دەیبـەم بـۆ لای بـەیتاڵێك کە لەوانـەیە نەخوێندەوار بێت نایبەم بۆ لای فەیلەسوفێك بـا زۆر زانـا بێـت و زۆر گـەورە بێـت یـان لای ئەنـدازیارێك کـە لەوانـەیـە نەخشـەی زۆر گـەورەی ئەندازەو هونەر بکێشێت.

مرۆڤ لە ئەسپێك و سەعاتێك زۆر بە ئەرزش ترە ئاخر چۆن دەکرێـت مـن مـرۆڤ بدەمـە دەسـت کەسـێك بەرنامـەی بـۆ دابنێـت کـە هێشـتا مرۆڤی تـەنیا لەیەك بارەوە نەناسیوە؟

دانـانی بەرنامەیـەك بـۆ بـەڕێوەبردنی ژیـانی مـرۆڤ بـەبێ پشـتیوانەیەکی زانستی-جاهلیەتـە- (بەرامبـەر زانستەوە جەهلـە)، فەیلەسـوفێك کـە نازانێـت برغوێك ببەستێت-جاهلە- بەکاری میکانیکی.

ئەنـدازیارێکی گـەورە کـە نازانێـت دەردی ئەسـپێك چارەسـەر بکات-جاهلـە- بەکاری بەیتاڵی.

وە ئەگـەر مـن بـێم کـاری چـاك کردنــی سـەعاتێك بخەمــە سـەر شـانی پرۆفیسۆرێکی فیزیـایی-جاهلیـەتم- کـردوە، لەبـەر ئەمەیـە کـە ئێمـە باوەڕمـان وایە هـەر بەرنامـە و یاسایەك بـۆ مـرۆڤ دابنرێت و لەلایـەن خـالق و خـاوەنی مرۆڤەوە نەبێت جاهلیەتە.

ئەمە ناو و ناتۆرەیەکی ناشیرین و شکاندن نی یە بـەڵکو بـەیانی ڕاسـتیەکی سادەو بەڵگە نەویستە.

(٢)- مەسەلەی مهدیون ئەوەیە-سابقین بـالخیرات- لـە ئایـەتی قورئانـدا بـاس دەکرێت، ئەوانەی وا دەبنە ئومەتی قورئان واسلامیان پێ دەگات سێ جۆرن:-

١-ظـالمین، ٢- مقتصـدین، ٣- سـابقین بـالخیرات. ئـەو مهدیونـە ئـەو سـابق بالخیراتەن هەر ئەبن و خوا زۆر تریشیان بکات.

(٣)- وەك ئەم کۆمەڵگایانەی ئێمە –موسـڵمانانی ئـەمرۆ- کـە زۆربـەی یاسـاو فەرمانەکانی لە داب و نەریت و ئەم لاو ئەولا وەرگرتوە بێ ئـەوەی بـزانین کـە سازگارە لەگەڵ دینی خودادا یان نەء وە هەروەها ئەندازەیەکیشمان لـە دینـەوە وەرگرتوەئەم تێکەڵ و پێکەلەیە کە نە دینی خوایە و نە جاهلیەتێکی تـەواو و خەست وپڕە.

(٤)- نـەك بزانێـت و بـەڵام لەبـەر هـەوا یـان هـەر شـتێکی تـر بەهرەمەنـد نەبێت لە زانینی کەسانی تر پەنا بەخوا بەناوی خزمەت کردن بە دینـی خـوا، کابرا بیەوێت بە و شێوەیە وا حاڵی دەبێت هەر بە پێ ی حاڵی بونەکەی خـۆی کار بکاتو خوانەکردە ئەنجامی کارەکەی ببێتە بەلا لە پلەی یەکەمـدا بـۆ خـۆی وپاشان خراپ کردن و شێواندنی سیمای دین و سەرگەردان کردنی مرۆڤ.

(٥)- بەداخـەوە زۆر لـە زانایـانی اسـلام پێیـان وایـە اسـلام یـانی ئـەحكام لـە حالێكدا ئەمە بچوك ترین شتە.

(٦) ئەمـە ئامـانج و ئـاواتی ئیسـلامە كەلـە رۆژی یەكەمـەوە دەبێـت بـەو ئامانجـەوە دەسـت پـێ بكـەیت ئـەو كەسـە وا ڕابـەری دینـە و خـەڵك هیدایـەت دەكات بەرەو دین و تا ئێستاش كەس وەڵامی بانگەوازەكەی نەداوەتـەوە دەبێـت لە خۆیەوە دەست پێ بكات.

١-معنوی- بەرزی و زیادە بەشانەیەك- امتیاز- بۆ خۆی بەڕەوا نەزانێت.

٢- مـادی — لـە ڕوی مـالی یـەوە(خواردن و بـەرگ و مـاڵو حـاڵ) لـە پلـەی ناوەندی ئابوری كۆمەڵگەكەی خۆی باشتر نەژی- چینە وەسطەكان -.

ئەم پلە نـاوەنجی یـەی ژیـانی مـاڵی بـۆ ڕابـەرێك زۆرە و ئـەبێت وەك چـینە داماو و خوارەكانی كۆمەڵەكەی بژی وەك هەژاران- ئەمەیە مانای قسط-.

لـە رۆژی یەكـەمی ڕاپـەرین و هەڵسـان و جوڵانـەوە ئـەبێت ئـەو ڕابـەرە لـە خۆیەوە دەست پێ بكات تا پاشـان بتوانێت وردە وردە تزكیـەی خـەڵك بكـات و پەروەردەیان بكات بە پێـی ئـەو مـەرام و ئامانجـە تـا كاتێـك حكومـەتت كەوتـە دەست بتوانیت بە جوانی —قسط- دابین بكەیت.

ئاشـكرایە ئەمـەش بـە پـێ ی شـوێن و سـەردەم دەگۆرێـت بـۆ نمونـە لـەم سـەردەمەدا كـە داهێنانـەكانی زانسـتی كامپیوتـەر زۆر یارمـەتی دەرن كـە بـە ئاسان تر ئەم كارانە دابین بكرێن بـۆ نمونـە(برینی دەسـتی دز، شـەلاق دان لـە شەراب خـۆر) هـەر لـە سـەرەتای ئیسـلام و رۆژەكـانی یەكەمـەوە دەكـرا؟ دیـارە كەوانەبوە، اقامە قسط ئـەوەی كـە پەیوەنـدی بەرابـەرەوە هەیـە دابـین كردنـی قسـطە بەسـەر خۆیـدا لـە روی مـادی و معنـوی یـەوە تـا وردە وردە شـعائر و عبادات دێتە پێشەوە و شێوەی گشتی نوێژ معلوم دەبێت و زەكات دێتە مەیدان بـۆ رێكخسـتنی ئابوری،(مجتهـد دەبێـت بزانێـت ئەوانـە وا لـە بـارەی زەكاتـەوە پێغەمبـەر( ﷺ) وتویـەتی پەیوەنـدی بـە كـارو بـاری حكومـەتی ئـەو رۆژەوە

هەبوە ئەگینا سنوری نصاب ئەوە نی یە وا وتراوە، نە اموال زکوی ئەوانـەن وا دانراوە و نە ئەندازەی زەکات ئەوەیـە وا دیاری کـراوە ئەمـە فـەرمان و یاسـای حکومەتی اسلام بوە لـەو سـەردەم و جێگـە تایبـەتی یـەدا هیچیان هەمیشـەیی نین وەك لە قورئاندا دەتوانین حالی بین) ﴿كَیْ لَا یَكُونَ دُولَةً بَیْنَ ٱلْأَغْنِیَاءِ مِنكُمْ﴾.

اقامة قسط:- گەڕانەوەی ژیانی خەلك لە پلەی سـەرو و خـوارەوەوە بـۆ پلـەی ناوەنجی ژیانی مادی و معنوی هەر تاکێ لە کۆمەلدا.

واتە وەك ئەوەی کە دەلێن بە پێ ی سـەر ژمێـری و حسـاب دەرامـەتی هـەر تاکێك لە کۆمەلدا ئەم ئەندازەیەیە بەوە ئەبێت هەمو ئەنـدامانی ئـەو کۆمەلـە بـەو شـێوەیە و لـەو ئەندازەیـەدا بـژین نەسـەرو تـرو خـۆش تـر نـەخوارترو ناخۆش تر(إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ) —تا اخر-.

(٧)- زەکات هەر لە سەرەتاوە هەبوە، بەلام پێغەمبـەر( ﷺ) امـوال زکـوی و مقداری زەکات و سنور و ئەندازەی زەکاتی دیاری نەکردوە، هەمومان خـەلکانی وەك خدیجەی کبری و ابوبکر صدیق- سلام الله علیهما- - دەناسین و دەزانین کـە چۆن هەرچیان هەیە دەیبـە خشـن بـەبێ سـنور، بـەلام کاتێـك ژمارەیـان زیـاتر دەبێت زەکات پێویستی بە بەرنامەیەکە بۆ ڕێکخستنی باری ئابوری موسلمانان وەك دەیبینین بیت المال دادەنرێت.

(٨)- ڕەنگە بزانیت و ئاگادار بیت بەرنامەیەك کـە مـن دامنـاوە بـۆ —مکتـب قورئان- لەبەر ئەوە زیاتر ڕۆنی ناکەمەوە، تا گەیشتینە سالی ١٩٧٨ کـە شۆرشـی اسلامی ایران دژی شا هەلگیرسـا و زۆرتـر ناوچـە شیعەنشـینەکانی گرتبـوە مـن بەتەکلیفی دووەمی خۆم زانی کە هەولْ بـدەم ئـەهلی سـوننەت بەشـانی ئـەهلی تەشەییوع بەشـداری خـەبات بکـەن و دژی شـا بـن کـە حکومـەتێکی زۆردار بـو، لەبەر چەند هۆیەك کـە نـاو بـەناو باسـم کـردوە کـە گـرنـگ ترینیـان ئـەوە بـو دەترسام شاو ئەمریکا شەڕی براکوژی لە نێوان سوننی و شیعەدا بەرپا بکـەن و خوێنێکی زۆری بێ تاوان بڕژێت(پەنا بەخوا لە ڕشتنی ئـەو خوێنـە ناهەقانـە)

وە لە ڕواڵەتیشدا ئەمە بێت کە سوننی یەکان پارێزگاری لە بونی حکومەتێکی زۆردار دەکەن.

بەرنامەی ئەصلی خۆمان کە تزکیە و دەعوەت بو(لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکەمان اسلامی و جاهلی بو). بە ناچاری ڕاگرت.

پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەتای اسلامدا بەو شێوەیە کاری کردوە ئێمەش لەسەر هەمان شێوە بەرەو پێش دەچوین بەلام لێمان تێکچو لەبەر ئەو بەشداری کردنەمان لە شۆرشی دژی شادا(دەعوەت لە کەسانێکی تایبەتی و پاشان تزکیە کردنیان بۆ دابین کردنی ئایندەیەکی اسلامی) ئەم قۆناغە بە پێی یەکتری بەرەو پێش دەچن و گەشە دەکەن جا چی ڕویدا و چیمان بەسەر هات جار جار باسم لێوە کردوە لەبەر ئەوەی لە ڕوی-تزکیە- پێ نەگەیشتبوین زیانێکی زۆرمان لێ کەوت چونکە کارێکی وا گەورە پێویستی بە ڕێکخستنێکی گەورەیە کە لەبەر ئەوەی ئێمە لە سەرەتای دەعوەتەوە بوین و ئامادەگی ئەو کارەمان نەبو خراپ شکایەوە بەسەرماندا.

ئێستاش هەر لە سەرەتای کارداین- رشد- بە پێی ساڵ دیاری ناکرێت، قۆناغی تزکیە و دەعوەتی گشتی لە سەردەمی پێغەمبەردا ١٣ ساڵ بوە، لەوانەیە لە شوێن و سەردەمێکدا ٥٠ساڵ بێت یان زۆرتر زیاتریش کە بە پێی خەڵکی ئەو شوێنە و چۆنیەتی ژیان دەگۆڕیت.

کەسێك کە چوار دەوری بە چەندین بیری الحادی و نالەباری تر گیراوە حاڵی کردنی زۆر زەحمەت ترە لەو کەسەی کە خاوەنی فکرێکی الحادی یان خەراپی تر نی یە، یەکەمیان زۆر سەختە و دووەمیان زۆر ئاسانە و هەر چۆنێك بتەوێت وا پەروەردەی دەکەیت ئەمە هەمو شتێك دەگرێتەوە هەروەها فکری دینی.

ئەوەی کە ئێمە توشی بوین بە هۆی ئەو تکلیفە دووەمەوە زۆر دوری خستینەوە لە بەرنامە سەرەکی یەکەی خۆمان-تزکیە و دەعوەت- وە هەروەها

زیـانێکی زۆرمـان لێ کـەوت، گـەورەترین زیـان ئـەوە بـو کـە کـەوتبو لەپایـەی باوەڕی خۆم(خۆشەویستی هەژاران).

(٩)- بەرنامەی کاك احمد بۆ مەکتـەبی قورئـان کـە لـە دوای سـاڵی ١٩٦٤ وە دەسـتی پـێ کـردوە بریتـی بـوە لـە تزکیـە و پـەروەردەو فێرکردنـی خـۆی و ژمارەیەك و دەعوەتی گشتی لـە خـەڵك بـەرەو اسـلام، بـەلام وەك لـە باسـەکەدا هاتوە ئەم بەرنامەیە بە هـۆی ڕوداوی سیاسـی شۆڕشـی خـەڵکی ایـران دژی شـا-١٩٧٨- بـە ناچـاری دەوەسـتێت و تـەکلیفێکی تـری چـاوەڕوان نـەکراو دەگرنـە ئەسـتۆ ئـەویش بەشـداری کردنـی سـونییەکانی ایرانـە وێـرای شـیعەکان دژی حکومەتی شا ئـەم روداوە بەرنامـەی- مکتـب قورئـان- دەگۆڕێـت بـە بـێ ئـەوەی هـیچ زەمینـە و ئامـادەگی بەشـداری کردنـی کـاری سیاسـی و بەدەسـت هێنـانی دەسەڵاتی سیاسیان هەبێت بەناچار کەوتنە ئەم قۆناغەوە وە بەرنامە سـەرەکی یەکە واتە تزکیە و دەعوەت گۆڕا، بەڵام ئەمە تکلیفێکی سانەوی بو بۆیە پاشان گەڕانەوە سەر تەکلیفە سەرەکی یەکە تزکیەی خۆو دەعوەتی خەڵك.(کامەران)

(١٠)- لێرەدا پێم خۆشە یەکێك لەو نەخۆشی یانەی بە هۆی ڕێکخـراو بـازی و حزب گەری یەوە توشی بوم بخەمە بەرچاو، یـەکێك لـە نەخۆشـی یـە سـادەو ساکارەکان ئەوەیە کە یەك یەکێك لە ناو حزب و ڕێکخراوەدا کێش و قورسـایی یەکیان بۆ دروست نەبێت کە لە پێش هەمو کەسەوە خۆیان توشـی زیـان دەبـن لەبـەر ئـەوە ئەگـەر مزگـی نـەبن و خۆیـان پـەروەردە نـەکردبێت توشـی غـرور دەبن توشـی استکبار دەبـن خۆیـان بـە بـانترو بـەرز تـر لـە خـەڵکی تـر حساب دەکەن، تەنانەت لەوانەیە لە ڕوی ژیانی مادی یەوە خۆیان جیا بکەنەوە ژیـانی خۆشتر بەرەوا لە ڕوی ژیـانی مـادی یـەوە خۆیـان جیـا بکەنـەوە ژیـانی خۆشـتر بەرەوا بزانن بۆ خۆیـان کـە بـەهۆی ئـەم نەخۆشـی یـەوە وردە وردە هـەوەس و ئـارەزوی ئـەمرو نـەهی پەیـدا دەکـەن کـە پـەنا بـە خـوا امـرو نهـی یـان ئەگـەر موافقی دین بێت یان موخـالیف دەبێت(اطاعـە بکرێـت) ئـەوە طاغـوتێکی تـر دروست بو لە ڕێ ی دینەوە، پاشان خەڵکی تریش دوو دەستەن-

١-برێك لە خۆیان ڕانابینن و ئەهلی ئەوە نین کە ئارەزوی ڕابەری بکەن.

٢- برێـك لـە خۆیـان ڕادەبیـنن، ئـەم دەسـتەیە دەسـت دەکات بـە ململانـێ و داکۆکی لەگەڵ ئەو طاغوتە دینی یـەدا و ئـەڵێ- شـەمە لەمەنـە کـەمتر- نـەخێر نابێت تـۆ ڕابـەربیت و دەبێت خـۆم بم، دەسـتەی یەکـەمیش وەختێـك ئەمـە دەبینن بێچارەو سەرگەردان دەبن بەرەو کام لابچن، ئەزانن کە خۆیان ڕابەریان پێ ناکرێ و ئـەبێت شـوێن کـەوتوی لایـەك بـن، دەبیـنین لێـرەدا شـەڕی-تفـرق- هاتـە کایـەوە﴿فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ﴾ بـو بـە خـەڵاتی بـاڵای ئـەو کەسـانە وا بـێ شایسـتەگی و لیاقـەت و توانـاو تزکـی یـەکی کامڵ بۆنەتە سەرکردەی ڕێکخراوێك و ئەو شێوە و ڕواڵەتیان هێنایـە کایـەوە و ئەو دەسەڵاتەیان پەیدا کرد.

(١١)- ئەمـە امـت نـی یـە کـە ئێسـتا هەیـە ئـەم سـنورانە کـە دروسـت کـراون بەلگەیەکی ئاشکرایە، (عـیراق و ایـران و ترکیـە و میسـرو روم.... هتـد) پاشان هەر یەکێك لەو ولاتانەش هەر امت (بە پێ ی تێگەیشتنە قورئانی یەکە) نیـە، امت واتە هەمو ئەندامان و خەڵکی ئـەو میللەتـە بـەرەو یـەك ئامـانج دەڕۆن و هاودەنگن بەیەکەوە، ڕانە مەڕێك کە هەمویان بەیەکەوە بـەرەو ئاوێـك دەڕۆن- امـت- تـرە تـا ئـەم میللەتانـە، بـەم شـێوەیە کـە قورئـان دەفـەرموێت ئەوانـە هەمویان-امم امثالکم- ئەو امت ترە لە ئێمە.

(١٢)- ئـەویش هەڵەیـە کەسـانێك وا بـزانن مصـڵحتیان لەگـەڵ هـەق جـۆر نابێت، مصـڵحتیان لەوەدایـە لەگـەڵ هەقدا خۆیـان بگونجێنن ئەگـەر مصلحت ڕێت پێ نادا ببیتە هاوڕێ لە ڕێ ی خوادا کەیفی خۆتە، ئەبێت ئاوا بێت.

(١٣)- بەر لەم پرسیارانە بـۆم بـاس کـردی دوای دەرچونم لـە زینـدانی قـزل قلعە لە زەمانی شادا زانیم هەمو ئەوەی پێشتر کردومە هەڵە بوە و هاتمەوە بۆ کوردستان و شاری سنە، بۆم باس کـردی کـە چۆن خـەریك بـوم تـاك تـاك ئـەم

فڕانـدن تـا وردە وردە بانگیـان بکـەم و مەسـەلەی دینیـان بـۆ بـاس بکـەم، ئـەو کۆمەڵەی خۆم ئاوا بو تەواو نهێنی و ئەبێت بەو شێوەیە ڕەفتار بکرێت.

(١٤)- ماوەیەك گێژاوی- کفایەتی قورئان- زۆر سەرگەرمی کـردم پـێم وتـن بەڵێ قورئان- کاف- یە پڕو هەمو لایەنەیە(کفایـەتی قـران واتـە قـران کافییـەو ئیدی کارمان بە احادیث و سونەتەوە نـی یـە) بـەڵام بـۆ نمونـە- نوێـژ- قورئـان هەر فەرمانی گشتی بۆ داوە، بەڕای خۆم بکەم یان بەڕای کەسێکی تر؟

ئایا پێغەمبەر( ﷺ) شایستەتر نی یە لەو کەسەو لەخۆم؟

(لە کاتێکدا دەزانین پێغەمبەر( ﷺ) زۆر لە قورئان زیاتر وحی بـۆ هـاتوە) بەڵام هەموی ئەو-وحی- یە تایبەتی یـە نـەبوە کـە بەدەسـتوری خـوا بمێنێـت و هـەمو وشـەو ڕسـتەکانی بەدەسـت لێ نـەدراوی بمێنێتـەوە و پـارێزراو بێـت بـۆ مرۆڤ، ئەگەر مەسەلەکە بێتە سەر اجتهاد هەر پێغەمبەر( ﷺ) لـە خـۆم‌و لـە تۆ و لە گشت کەسێکی تر بە مجتهد تر دەزانم، ئەگەر قورئـان کـاف بێـت بـەڵام بۆ فلانە مەسەلە پێغەمبەر( ﷺ) بەشایستە تر لە گشت کەسێك بزانـە، ئەمـە مەبەستەکە بو.

(١٥)- وشـەی-اخـوە- ژن و پیـاو دەگرێتـەوە واتـە بـرا و بـرا، خوشـك و بـرا، خوشك و خوشك.

(١٦)- لە مەریوان دەربارەی بەهای یەکان باسێکمان کردوە ئەگەر گوێ ی بـۆ بگریت باشتر لە مەبەستم حالّی دەبیت.

(١٧)- فرعـەونی سـەردەمی یوسـف وەك فرعـەونی زەمـانی موسـا نـەبو، لـە چیرۆکەکەدا دەتوانین حـاڵی بـین کـە زۆر کـات باسـی خـوا دەکـەن، باسـی ئـەوە ئەکەن کە مرۆڤ دوچاری هەڵە دەبێـت مەگـەر خـوا بیپارێزێـت، نـەوەك ئـەوان نەبون بەڵام موسی( ﷺ) هەرگیز ڕێگەی نیە ئەو کارە بکات لەگـەڵ فرعـەونی سەردەمی خۆیدا وەك چۆن وتم کە زۆر جار ڕێگات نی یـە بچیتـە پەرلـەمان و بەشداری بکەیت، ئـەم فرعەونـەی سـەردەمی یوسـف لەسـەر ڕێ ی دیـن نـەبون بــەڵام دژی دینــیش نـــەبون وەك حکومەتـــەکانی ئێســـتای زۆربـــەی وڵاتـــە

اسلامیەکان کە حکومەتی اسلامی نین بەڵام لەگەڵ اسلامدا لەشەردا نین، حکومەتی سەردەمی یوسف(ﷺ) حکومەتێکی غیر دینی بو بەڵام کافر نەبو غیر دینی شتێکە و کافر شتێکە.

(١٨)- کاك هادی مرادی پرسیاری کرد لە ناونیشانی ئەو کتێبە زۆر بیرم کردەوە لە هەمو ئەو کتێبانەی کە رۆژهەڵات ناسەکان نوسیویانە پێم وایە ئەم کتێبەم پێ ناساند بە ناوی –عوزری کەمکاری و نەزانیم لە خزمەت محمد و قورئاندا- کاك هادی ئەو کتێبە دەخوێنیتەوە سەیر دەکات ئەم شتەی تێدا نی یە و پاشان پرسیاری کردەوە منیش رێنمایم کرد کە کتێبی رۆژهەڵات ناسەکان بخوێنێتەوە چونکە نازانم کام کتێبەیە و لەبیرم نەماوە.

# فیطرەت و هیدایەت

لەگەڵ ئەوەدا کە قورئـان لـەڕوی فیطـرەتـەوە هـەمو مرۆڤێـك بـە موسـڵمان دەزانێـت و دەفــەرموێت ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴾ (ســورة الــروم:٣٠) یـــان: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى ﴾ (سورة الأعراف:١٧٢)

دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە نەوەکانی ئادەم ڕێی فیطرەتیـان لێ تێـك چوەو فیطـرەتـی موسـڵمانانەیان ناتوانێـت دووبـارە بیانگەڕێنێتـەوە بـەرەو ئیسـلام، بۆمان ڕونبکەیتەوە کە بۆچی لە ڕێی فیطرەتیانەوە ناگەڕێنەوە بەرەو ئیسلام ونەخش و دەوری هیدایەت لەم نێوەدا چیە؟

بسم الله الرحمن الرحیم

سەرەتا ڕونکردنەوەیەکی سادە دەربارەی وشـەی فیطـرەت پاشـان ڕۆچـونێك دەربـارەی — فیطــرەتــی مــرۆڤ پــاش ئــەم دوو شــتە وەڵامــی پرسـیارەکەت دەدەمەوە.

فیطـرەت واتـە بـون و مەوجودیـەتی هـەر شـتێك بـەو شێوەیەی کـە هەیـە، بونێـك کــە تێکــڕای ئــەو شــتە لــە شــتەکانی تــر جــوێ دەکاتــەوە، هــەمو تایبەتمەندییەکانی مـەوجودێك بەیەکەوە فیطـرەتـی تایبـەتی ئـەو شتە پێـك دەهێنن، بەشێوەیەك، کە تێکڕای ئەو سیفەتانە مەوجودیەت و بونی ئـەو شـتە پێـك دەهێـنن، بەشـێوەیەك لــە ســەرجەمدا بــەو تایبەتمەنـدی و پێناسـانە

مــەوجودات لەیــەك جیادەكرێنــەوە، فیطــرەتــی هــەر شــتێك ســیفات و تایبەتمەندییەكە، كە كەسێك لە شتەكانی تر جیادەكاتەوە، لەوانەیە هەندێ لەو بەشانەی كە فیطرەتی شتێكیان پێك هیناوە لە شتێكی تریشداهەبن، بەلاّم سەرجەمی ئەو بەشانە بەیەكەوە تەنیا لە یەك شت دا هەیە، بەم شێوەیە ڕوندەبێتەوە، كە فیطرەت تەنیا بۆ مرۆڤ نییە هەر شتێكی بێ گیان و گیان دار – فیطرەتی هەیە، ئەم فیطرەتە جۆراوجۆرانەیە، كە بونەتە جیاوازی و جودایی مەوجودات لە یەكتر، ئێستا سەیرێكی فیطرەتی مرۆڤ بكەین بەپێی ئەو پێناسە گشتی و ئاشكرایە فیطرەتی مرۆڤ: كۆمەڵێك سیفات و تایبەتمەندی یە، كە مرۆڤ لە باقی دروستكراوەكان جیا دەكاتەوە، هەڵبەتە لەگەڵ ئەوەدا، كە مرۆڤ بەتەواوی نەناسراوەو زەمینەی ناسینی تەواوەتیشی نییە، ئێمە بە هەڵسەنگاندنی مرۆڤ لەگەڵ مەوجوداتی تردا بەتایبەتی گیانداران تا سنورێك پەی بە فیطرەتی مرۆڤ دەبەین، هەمو ئەو شتانەی، كە فیطرەتی مرۆڤیان پێك هیناوە لەگەڵ مەوجوداتی تر بەتایبەتی گیانداران جیای دەكەنەوە زۆرن، ئێمە لێرەدا سێ دەستەی سەرەكی جیا دەكەینەوەو دەست دەكەینە توێژینەوەو لێكۆڵینەوەیان بەشێوەیەكی گشتی، تا ئەو پرسیارەی كراوە وەلاّم بدرێتەوە.

سێ دەستەی سەرەكی پێك هێنەری فیطرەتی مرۆڤ بریتیە لە:

١- غەریزەكان.

٢- هەست و شعور، یان بەرئەنجامەكانی هەست و شعور و سیفاتە دەرونییەكان یان بڵێین:اخلاقیات –ڕەوشتەكان.

٣- هێزی شیكردنەوەو توێژینەوە (فكر و عقل) بیرو هۆش.

هەر یەك لەم سێ دەستەیە دەتوانرێت بەچەند بەشێكی فراوان دابەش بكرێت، جگە لەم سێ دەستەیە زۆر مەسەلەی تر هەیە كە تایبەتە بە فیطرەتی مرۆڤ و بەم هۆیەوە لە مەوجوداتی تر جیا دەبێتەوە، بەلاّم لێرەدا

باس لەوانە ناكەین، ئێستا ئەم سێ بەشە سەرەكیەی فیطرەتی مرۆڤی لێ پێك هاتوە، یەكە یەكەو بە جیا شی دەكەینەوە.

یەكەم غەریزەكان: كۆمەڵە هێزێكە لە مرۆڤدا، كە ئەسڵی ئەمانە لە باقی گیانــدارانی تریشــدا هــەن بەچــەندێك جیاوازییــەوە، غــەریزەكان نــەك تــەنیا لەنێوان مرۆڤ و باقی گیانداراندا جیاوازی هەیە، بەڵكو لە نێوان گیاندارانیشدا جیاوازی هەیەو لەیەك ناچن.

بەهەر حاڵ غەریزەكان ئەو كۆمەڵە هێزەن لە مرۆڤدا، كە مرۆڤ هان دەدەن بــۆ دابــین كردنــی ئــەو شــتانەی بــۆ ژیــان پێویســتی پــێ یــەتی و ســودیان لێ وەردەگرێت، بۆ نمونە: غەریزەی پارێزگاری لەخۆ،(حب الحیــاة) یــان غــەریزەی خواردن و نۆشین، غەریزەی جنسی و باقی غەریزە گەورەو بچوكەكانی تر.

سادەترین غــەریزە غــەریزەی خواردنــە (پێویستی بــە نــان و ئــاو)، كــە ئــەم غەریزەیــە هاوبشــە لــەنێوان مــرۆڤ و بــاقی گیانــدارانی ناســراوی تــردا، چــونكە لەگەڵ مەسەلە ئاڵۆزە ڕەوانی یەكانی مرۆڤدا زۆر پەیوەندی نییــە توێژینــەوەو شیكردنەوەشی زۆر گران نییە، بــا ئــەم غــەریزە ســادەو ســاكارە، شــی بكەینــەوە، پاشان حاڵی ببین، كە (فیطری بون) مانای چی یە؟ چ بــارو حــاڵ و ئــەحواڵێك كــار دەكاتــە ســەر ئــەم مەســەلە فیطــری یــە، ئەگــەر ئــەو ئەحواڵە نادروست و پێچەوانەی مەسیری غەریزە بێت و، لەجیاتی خێرو سود ببێتــە مایــەی شــەڕو زەرەر چارە چی یەو دەرمانی كامەیە؟

فیطــری بــونی ئــەم غەریزەیــە بــەم واتایەیــە كــە غــەریزە بــەهۆكاری – پەروەردە- یان- فێركردن و تێگەیاندن- یان- ڕەفاقەت- یان- حاڵ و بارێك كە لە پاشدا بەدی هاتوە – پەیدا نەبوە – بەڵكو ئەمە حاڵەتێكی پێویست و هاوڕێی خــەلق و دروســت بــونی مرۆڤــە، دەلیلــی ئــەوەی، كــە فیطــرییــە هــەر ئــەم مەسەلەیەیە.

زانیمـان کـە ئـەم غەریزەیـە – جگـە لـە جیاوازیـەکان – لـە نێـوان مـرۆڤ و گیانداران دا هاوبەشە، کاری ئەم غەریزەیە لە گیاندارانی تردا هەرچی بێت لـە مرۆڤیشدا هەمان کاری هەیە واتە: نیازەکانی مرۆڤ لە خواردن و خواردنـەوەدا بە مرۆڤ دەناسێنێت و هانی دەدات بـەرەو ئـەوەی بەدەسـتیان بهێنێـت و سـودو بەهرەیان لێ وەربگرێت، بەهەمان شێوە، کە لەهەر گیاندارێکی تـردا کـاری ئـەم غەریزەیە – هاوشان لەگەڵ فیطرەتی ئەم جۆرە گیاندارەدا – هەر ئەو کارەیە، گیانداران هانـدەدات، تا ئەوەی پێویستە وەکو نۆشین و خواردنەوەی ئاو دابینـی بکات، (کە مـرۆڤ و گیاندار هاوبەشن تێیدا بەڵام شێوەی خواردنەوەکەی فـەرقی هەیە).

جۆرێك لە گیانـداران جـۆرە خواردنێکیـان هەیـە و جـۆرێکی تـر خواردنێـك گونجـاوی خـۆی و جیـا لـە ئـەو، غـەریزەی خـواردن پاڵیـان پێوەدەنێـت، کـە بـۆ بەدەست هێنـانی خـواردن و نیازمەنـدی یـەکانی لەشـی هـەوڵ بـدات، هـەروەها غەریزەی خواردن لەمرۆڤدا هەمان کاری هەیەو مـرۆڤ وا لێ دەکات هەوڵ بدات بۆ بەدەست هێنانی پێویستیەکانی بەدەنی و ئـەو شـتانەی پێویسـت و بەسـودو سازگارن بۆی.

ئایە جگەرە لەو شتانەیە کە مـرۆڤ پێویستی پێیەتی؟

خواردنەوەی سەرخۆشکەر و هیرۆئین و موخەدیرەکانی تر پێویسـتی لەشـی مرۆڤن؟

ئاشـکرایە کـە هـیچ کـام لەمانـە لـە نیازەکـانی بـەدەنی مـرۆڤ نیـە، لەگـەڵ ئەوەشدا دەبینین مرۆڤ بەشێوەیەك دەگۆڕێت کـە هـەروەك چـۆن هـەوڵ دەدات بۆ شتە بەسودو پێویستەکان ئاواش هەوڵ دەدات بۆ شتە زیانمەنـدەکان و هەوڵ و حـەزی خـۆی نیشـان دەدات و تەنانـەت زۆرتـریش هـەوڵ دەدات و شـێلگیرتر دەبێت، بۆچی؟

مەسەلەکە لێرەدا زۆرتر ڕۆشن دەبێتەوە، غەریزەکان بەشێکن لە فیطرەتـی مرۆڤ و ئەرکەکانی وەك وتمان ئەوەیە، کە مرۆڤ هەروەکو بـاقی گیانـدارانی تـر

بەرەو بەدەست هێنان و مەسرەفی خواردنە بەسودو پێویستەکان هان بدات، دەزانین کە ئەو شتانەی پێویست نیە، (مشروبات و مخدرات) کەواتە بۆچ بەدویدا ڕادەکات و بۆ خواردن و بەکارهێنانیان هەوڵ دەدات؟ بەڕاستی مرۆڤ مەوجودێکی سەرسوڕهێنەرە! لەگەڵ ئەوەدا، کە بەشێك لە فیطرەتی بریتی یە لە –عقل- هۆش(کە پاشان باسی دەکەین) لە کاتێکدا دەبینین بەشی زۆری جیاوازی یەکانی مرۆڤ لە گیاندارانی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بنەمایەو بەهۆی ئەمەشەوە دەبێت هەوڵ بدات، تا ژیانی لە گیاندارانی تر چاکترو جوانتر بێت، لەگەڵ ئەمەشدا بەهۆی ئەم شتەوە – هۆش - کە بۆتە مایەی جیاکردنەوەی لە گیاندارانی تر لە تەواوی گیانداران خراپتر دەبێت، زۆر مەسەلەیەکی عەجیبە! و ڕازو نهێنی – نیاز بە هیدایەت – هەر ئەم شتەیە، کە لە پاشدا باسی دەکەین.

گیاندارانی تر بەپێی نیازەکانی غەریزە هەوڵ دەدەن ئەوەی، کە لەشیان پێویستی پێیەتی و گەشەی پێ دەکەن و ژیانیان بەوەوە بەندە بەدەستی بهێنن و بیخۆن، دەبینین کە لەجێ بەجێ کردنی داخوازی غەریزەیان سەرپێچی ناکەن.

لەو سالأنەی پێش شۆڕشدا (شۆڕشی ئیسلامی خەڵکی ئێران) جار جارە کەسانێکی مەشروب خۆر بۆ چارەسەری کێشەی خێزانی، کە زۆربەی جار ئەو کێشانەی بەهۆی مەشروبەوە بو- دەهاتنە لام و ڕۆح و ڕەوانیانم ئامادە دەکرد، تابتوانم بە سۆعبەت- شۆخی، یان بەڕاست-جدی- هەندێك شتیان لەگەڵ باس بکەم (چونکە ئەگەر ڕۆح و حاڵی ئەو کەسە ئامادە نەبێت و ئەم باسانەی لەگەڵدا بکەیت زۆر گوناهە ئەمە دەستوری خودایە ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾(سورة النحل: ١٢٥).دەبێت کەشی دۆستی و حاڵی بون فەراهەم بێت تا بتوانێت جار جارە لە مەزرای باسێکی جدیدا چەند شتێکیش لە قاڵبی سوعبەتدا بڵێیت).

هەلومــەرج دەرەخســاو دەرون و ڕۆحیــەتی ئــەو کەســەم ئامــادە دەکــردو دەمگـوت: پرسـیارێکی فورسـم بـۆ پـێش هـاتوە، کـە دەمـەوێت لـەتۆ بپرسـم: دەیوت: فەرمو: دەموت: بەڕاستی تـۆ عاقڵیـت، یـان کـەر؟ دوای ئـەوەی کـەمێك سور دەبۆوەو پێکەنینی دەهات، دەمـوت بـا کـەمێك مەبەسـتەکە ڕونـتر بخەمـە پێش چاوت، ئێمە باسی کەر دەکەین بە عنوانی نیشانەو هێمای تێنەگەیشتن و حەماقـەت، کاتێـك دەربـارەی گـەوجیی کەسـێك زۆر موبالەغـە دەکـەین پێـی دەڵـێین: کــەر، وایــە؟ دەیــوت: بــەڵێ: ڕونم دەکــردەوە، کــە ئێســتا بــێین و هەڵسەنگاندنێك لەنێوانی تۆو کەردا ئەنجام بـدەین، گـەوجی بپێـوین و بـزانین لە کامتاندا زۆرە؟

بزانین شتێك، کە لە بەرژەوەندی کەر نییە تێکەڵی ئالیکەکەی بکە لەگـەڵ ئەوەشدا، کە دەستێکی وەك دەستی مرۆڤی نیـەو تـەنیا لـۆزی هەیـە، دەبینیـت ئەو شتە زەرەر مەندە لە ئالیکەکەی جیا دەکاتەوەو فرێـی دەداتـە لایـەکی تـرو مەگـەر بـە ڕێکـەوت ئـەگینا نـایخوات، مەگـەر بەشـێوەیەك لەگـەڵ ئالیکەکەیـدا تێکەڵ بوبێت، کە سەرنج نەدات بیخوات.

دانی بەم مەسەلەیەدا دەناو دەیوت: بەڵێ ڕاستە.

دەموت: برا گیان تۆ بەخەیاڵی خـۆت مرۆڤیـت و عاقـڵ، مەگـەر نـازانی، کـە مەشروب زەرەری هەیە بۆت؟

یەکـەم تـۆ بـەچ زەحمـەتێك کـار دەکـەیت تـا پارەیـەك بەدەسـت بهێنیـت (بەداخەوە زۆربەیان لەو زەحمەت کێشانە بـون، بەڕاسـتی دڵـم پێیـان دەسـوتا، ئەگەرنا ئەوانەی بەخواردنی هەقی بـێ هێـزان و بـەبێ زەحمـەت و نامەشـروع پەیـدایان دەکـردو خـەرجی تێنەگەیشـتویی خۆیـان دەکـرد بەهـەرحاڵ، بـەڵام بەڕاسـتی دڵـم بـەم زەحمەتکێشـانە دەسـوتا) چـەندە ڕەنـج دەکێشـیت تـا ئـەم پارەیــە بەدەســت دەهێنیــت لــەجیاتی ئــەوەی لەگــەڵ ژن و منداڵەکانتــدا بــۆ پێداویستی و دابین کردنی نیازەکانی ژیانتـان خـەرجی بکـەیت شـتێك بکرِیـت، کـە نیـازو سـەلامەتی لەشـتان فەراهـەم بکـات و ژیانتـان خـۆش بکـات، دەچیـت

ژەهر دەكرێت و دەیرێژێتە قورگتەوە! پارەی حەلاڵ دەكەیتە خەرجی حەرام و لەش و هۆشی خۆت نابوت دەكەیت و شەڕو ئاژاوەو ناكۆكی بۆ خۆت و خێزان ودۆست و ئاشنا پێش دەهێنیت، بێدار دەبونەوەو دەیانبینی: بەڵێ هەروایە، كارێكیان كردوە، كە زۆر ئەحمەقانەترە لەوەی تەنانەت ئاژەڵێك ئەنجامی بدات، زۆربەیان بڕیاریان دەدا، كە ئیتر دەست لەو كارە هەڵبگرن و دەستیان هەڵدەگرت و مرۆڤی باشیان لێ دەردەچو، بگەڕێینەوە سەر باسەكەی خۆمان.

زۆر سەیرە لەگەڵ ئەوەدا، كە هیچ پێویستی پێی نیەو غەریزە داوای جگەرە ناكات، داوای مەشروب ناكات، داخوازی مەوادی مخەدەر نیە، كەچی مرۆڤ حەز لەمانە دەكات، هەروەك چۆن هەوڵ دەدات بۆ نیازە ڕاستەكانی بەهەمان شێوە هەوڵ دەدات بۆ ئەمانە، هەروەكو- غەریزەیەكی ناوەندی- دێینە سەر بەشی دووەمی فیطرەتی مرۆڤ: ئەو كۆمەڵە توانایەی كە ڕەگ و بناغەی ڕەوشتی مرۆڤ پێك دەهێنێت و دەبینین كە لەم بەشەشدا مرۆڤ جار جارە لە ڕێگای فیطرەت چەواشە دەبێت داخوازی فیطرەتی شتێكە، بەلام ڕەوشت و ڕەفتاری شتێكی ترە، فیطرەتی ئازایەتی دەوێت لێی و ترسنۆكی بە خراپ دەزانێت، دەست ودڵ باش و سەخاوەت بە باش دەزانێت و بەخیلی و چروكی بەناپەسەند دەزانێت، ڕاستگۆیی بەباش دەزانێت و درۆزنی و فریوكاری ناپەسەندو دزێو، بەم شێوەیە هەمو سیفەتە چاك و خراپەكان بە مرۆڤ دەناسێنێت، ئەم شتانە بۆ مرۆڤ ئاشكرایە بێئەوەی فێركردن لەنێواندا بێت، لە دەورانی منداڵی یەوە، لەو كاتەوە دەتوانێت شتەكان لەیەكتری جیا بكاتەوە ئەمانەی بۆ دەردەكەوێت.

ئەخلاقیاتی گرنگ واتە: بنەماكانی ڕەوشت تێدەگات و هەر لە ڕوی فیطرەتەوە ئەوانەی خۆش دەوێت بێ فێركردن، فلان كار بە خراپ دەزانێت و ئەنجامی نادات، ڕاست دەڵێت و درۆ دزێوە بەلایەوە، كاتێك دەڵێین — فیطری-

مەبەستمان ئەوەیە کە بەفێرکردن و دەرس حاڵی نـەکراوە لێـی، بـە پـەروەردە کردن فێر نـەکراوە بـەڵکو لـە سروشـت و نـاوەرۆك و دەروونیـدا هەیـە، لەگـەڵ ئەمەشدا دەبینین، کە پێچەوانەی داخـوازی فیطـرەتی، پێچـەوانەی فیطـرەتـی ئـەخلاقی درۆ دەکـات، ڕاسـتگۆیی چـەند خۆشـە لـەلای کەچـی درۆ خۆشـترە بەلایـەوە!! ترسـنۆکی و زەلیلـی و بـێ شەخسـیەتی تەحـەمول دەکات وچـروکی وبـەخیلی دەکـات و بـاقی سـیفەتەکانی تـر، ئەمــەش دووبـارە شـتێکی سـەر سـوڕهێنەرە لـە مرۆڤـدا، لەگـەڵ ئـەوەدا فیطـرەت داخوازیـەکی هەیـە بـە پێچەوانەوە ڕێگەی دژی فیطرەت دەگرێتە بەر.

بەشـی سـێهەم، توانـای بیرکردنــەوەو توێژینــەوەو بیرکـاری یـە توانـای بیرکردنـەوەو هۆشـداری لـە مرۆڤـدا فیطـری یـەو ڕیشـەکەی بـەبێ پـەروەردەو فێرکـردن لـە مرۆڤـدا هەیـە (حالـەتی گەشـانەوەی نـالێم چـونکە گەشـانەوە تەزکیەو فێرکردنی دەوێت، بـەڵام بناغەکـەی بـەبێ تەزکیـەو فێرکـردن هەیـە، ئەگەر بنەمای شتێك لە مرۆڤدا نەبێت گەشانەوەی بێ مانایـە). ئـەم بەشـەش هەروەکو دوو بەشەکەی تر چـەند ئـەرکێکی هەیـە، هـەر بـۆ ئـەوەش دراوە بـە مرۆڤ کە ئەرکەکانی ئەنجام بدات.

سەرەتایترین، بەلگە نەویسترین و سادەترین ئەلفبای بیرکردنەوەی مـرۆڤ – ئەصلی – تعلیل - ە، ئەم ئەسڵە لە دەزگای دەرك و هۆشی مرۆڤ لەهەمو شـتێك سەرەتایی ترە.

ئـەوەڵین پایەیـە کـە هۆشـی مـرۆڤ بـەبێ فێرکـردن و بـێ ئـەوەی وشـەی – تعلیـل- بزانێـت ئەمــە درك دەکـات (بـاس دەربـارەی وشـەی تعلیـل نیـە بـەڵکو مەبەست ماناکەیەتی) بێ ئەوەی وشەی –علت– بزانێت، یان وشەی –معلول-ی بیستبێت دەزانێت هەر شتێك هۆکار –علت-تێکی هەیە، هەر شتێك وهەر کـارو کاردانەوەیـەك ببینێـت وهـەر شـتێك دەرك بکـات بەتایبـەتی ئەگـەر حالـەتی ناوێتەیی بێت –ترکیبی- وە لە سەرجەمدا یاساو بەرنامەیەك بەرچاو بکەوێت

یەکسەر بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەمە هۆکارێکی هەیە کە ئاوایەو بێ هۆکار ناتوانێت بەم شێوەیە بێت.

ئەم پایەیە سەرەتایی ترین مەسەلەی فیطرەتی هۆش و بیری مرۆڤەو باقی مەسەلەکانی تری هۆش و بیر لەسەر ئەم پایەیە دامەزراوە هیچ مەسەلەیەکی زانستی لە زانستە تاقیگەییەکان —صرفە-، هەروەها لە زانستە عەقلی و فەلسەفیەکان نیە، کە لەسەر پایەی تعلیل دانەمەزرابێت، ئەم پایەیە بنەمای تەواوی زانینەکانی مرۆڤە، بەدیهی ترین یاسای زانستی تاقیگەیی تا ئالۆزترین بنەمای زانستە عەقڵیەکان وەکو ماتماتیک و فەلسەفە لەم بنەمایە ڕەتبکرێتەوە، هەمو یاسا زانستیەکان ڕەتدەکرێنەوە (ئەو یاسا دانراو و قەرار دادیانە نالێم، بەڵکو ئەوانەی لە بونەوەردا هەیەو مرۆڤ پێیان دەزانێت و بەشێوەی یاسا بەیانی دەکات ) تەنانەت دوو ئەسڵی — زەمان و مەکان-، کە پایەی هەمو یاسا مادی یەکانی دونیایە، وەکو هەمو یاساکانی تر لەسەر پایەی —تعلیل- دادەمەزرێت.

پایەی —تعلیل- هۆکار بە ئەندازەیەك گرنگە کە نەك تەنیا لە بیری مرۆڤدا بەڵکو شتێکی سادەی دەرك و زانینی گیاندارانیشە سواری ئەسپێك دەبیت و لە جێگەیەکی ئارامەوە دەڕۆیت لەناو گژوگیادا خشەخشێك دێتە گوێ دەبینین، کە ئەسپەکەش گوێ هەڵدەخات لەبەر بونی ئەم پایەیە لەو گیاندارەشدا.

بیرکردنەوەو توێژینەوەی ناوێت، بەڵگە نەویستە بەتۆزێك هەست و دەرك لە گیانداردا ئەم پایەیە تێ دەگەیت، خشەخشێك بەر گوێی ئەم ئاژەڵە کەوتوە حەتمەن هۆکارێکی هەیە، لەوانەیە عیللەتەکە نەزانێت، بەڵام هەر ئەوەندەی گوێ هەڵدەخات یان مان دەگرێت و ناڕوات یان هەڵدەخاتەوە نیشانەی ئەوەیە، کە ئەم خشەخشە بە ڕێکەوت و بێ هۆکار نیە نابێت، کە هۆکارێکی نەبێت.

مرۆڤ لەبەر ڕۆشنایی فیطرەت دەزانێت، کە وجودی شتێك، یان چۆنیەتی شتێك، یان گۆڕانکاریەك، کە بەسەریدادێت پشت ئەستورە بە شتێکی غەیرە، کە هۆکارو زەمینەو بەدیهێنەری ئەو وجودە، یان ئەو چۆنیەتی و

گۆڕانكاریەیە، فیطرەتی عـەقڵ و كـاری گرنگـی تـری هەیـە، كـە لێـرەدا مـاوەی توێژینەوەیان نیەو بەم پایە سەرەتاییەی هۆش و بیر ڕازی دەبین.

مرۆڤ هەروەك و لەدوو بەشـی پێشودا چەواشـە دەبـو جـار جـارە لـە ڕێگـای فیطرەتی عەقلدا چەواشە دەبێت، بەپێی ئەو بنەمای – تعلیـل – ە، كـە ئـەلف وبای فیطرەتـی عـەقڵە ناتوانێـت قبـوڵی بكـات، كـە بچـوكترین گۆڕانكـاری كـارو كاردانەوە، كە لە شتێكدا ڕویداوە ڕێكەوت و بـێ عیللـەت بێـت، (هەڵبەتـە جـار جــارە وشــەی ڕێكــەوت بــۆ هەنــدێ ڕوداو بــەكار دەهێــنین، كــە مەبەســت ڕوداوكارێكن، كە لەپێشدا خۆمان بۆ ئامادە نەكردوەو بڕیارمان بۆ نـەداوە وەك پێك دادانـی دوو ئۆتۆمبێـل لێـرەدا كاتێـك دەڵـێین – ڕێكـەوت - مانـا عـەقڵی و فەلسـەفیەكەی واتـا شـتی بـێ عیللـەتمان مەبەسـت نـەبوە بـۆ پێـك دادانـی دوو ئۆتۆمبێل عەقڵ ناتوانێت بەبێ هۆكاری بزانێـت بـەكارهێنانی وشـەی ڕێكـەوت ئـەو ڕوداوە چاوەڕوان نـەكراو بـێ بەرنامانەیـە نـەك بـێ هۆكـار) مـرۆڤ هـیچ ڕوداووكارو كاردانەوەیەك بێ هۆكارو بـێ ڕێكەوت نازانێت، كەچـی جـار هەیـە دووچاری ئـەم هەڵەو شێواندنە گەورەیـە دەبێـت دروسـت بـونی بونـەوەر بـە ڕێكەوت دەزانێت.

هـەمو هەسـتی بریتـی یـە لەچـەند بـەش؟ هـەر هـەمو جۆرێـك و بەشـێك لەوانە دووچاری چەند كارو كاردانەوەیەك بـبن؟ ئەمـە هـەر حساب ناكرێـت و لە ژمـارە نایـەت، بـۆ بەشـێكی زۆر بچوك ناتوانێت پێچەوانەی ئەسـڵی تعلیـل قبوڵ بكات، ئەی چۆن بۆ تێكڕای بونەوەر، كە تەنیا خوا دەزانێ دەبێتە چـەند بەشی جۆراوجۆر _ ئەسڵی تەعلیل إنكـار دەكـات، بەڕاسـتی هێنـدە سـەیرە، كـە مـرۆڤ شـتێ تێناگـات، نمونەیـەكی سـادە بهێنمـەوە، كـە یـەك دانـە برغـو، یـان سەمونەیەك، یان دەرنافیزێكی بچوك، هیچ كەسێك ناتوانێت بڵێت بێ عیللـەت دروستكراوە، هەر ئاوا بەڕێكەوێت بە وجود هاتبێت، هەر ئـەم كەسـە ناتوانێـت ئەسڵی تـەعلیل لـەبارەی ئـەم هـەمو مەكینـە گەورانـەی، كـە سـەدان و هـەزاران پارچەی بچوكتر لەو برغوەو برغو سـەمونەی تـر پێـك هـاتوە ڕەت بكاتـەوە؟ و

سەدان پاساو بەرنامەی سەیر كە بۆ بەكارهێنانی ئەو مەكینەیە سودی لێ وەرگیراوە بە ڕێكەوت و بەبێ عیللەتی بزانێت!

پارچەو بەشە جۆراوجۆرەكانی یەك كامپیوتەر بەبێ عیللەت نازانێت ئایا جێی سەر سوڕمان نیە، ئەگەر ئەم كامپیوتەرە بە ئیشی ڕێكەوت و بەبێ عیللەت بزانێت؟!

كامپیوتەرێك بەهیچ جۆرێك ناتوانێت لەگەڵ بونەوەردا هەڵسەنگێنیت و، هیچ نیە بەنیسبەت بونەوەرەوە ئێستا دیارە كە ئینكاری ئەسڵی عیللەت بۆ بونەوەر چەند سەیرە؟!

سەرنج بدەن كامپیوتەر چیە؟ دەستگایەكە، كە مرۆڤ دروستی كردوە، مرۆڤ چەند شتێكی گەورە، كە دەستگای وەك كامپیوتەری دروست كردوە ئاخر ئەی مرۆڤــی مــەزن ئــەی مــەوجودی ژیــرو خــاوەن بــیر بەشـێكی زۆر كـەمی كامپیوتەرێك، كە لەملیۆنێكدا یەكی كامپیوتـەرێك نابێت، ناتوانیت بە ئیشی ڕێكەوت بزانێت و ڕەچاوی پایەی هۆكار نەكەیت چۆن دەتوانیت مرۆڤ دروست كەری كامپیوتەر بێ عیللەت ببینیت؟ چۆن دەتوانیت وابزانیت، كە بەڕێكەوت بە وجود هاتوەو ئەم شێوازو هێندە سەیرەی پەیداكردوە؟! بەڕاستی ئەم بینشە هێنـدە سەیرە، كـە لەشێت چاوەڕوان ناكرێـت، بـەڵێ چەواشـەبونی فیطرەت مـرۆڤ دەخاتـە ئەم ڕۆژەوە لـەپێش تـردا وتمان، كـە یـەك گیانـدار بەپێچەوانەی داخوازی فیطرەتـی شتێك نـاخوات لێرەشدا دیسان گیاندارێك ناتوانێت پێچەوانەی سادەترین داخوازی هەست و شعوری واتە خشە خشی گژو گیایەك بـە ڕێكەوت بزانێـت ئـەی مـرۆڤ ئایـە ئـەم بونـەوەرە بەقـەدەر خشـە خشێك بۆ حەیوانێك لەلای تۆ بەڵگەی بنـەمای عیللـەت نیـە؟ بـە ویـژدان وبـێ دەمـارگیری و توڕەبـون لەبـەر ئـەوەی مرۆڤیـت، ئەگـەر مرۆڤێـك بونـەوەر بـە ئەنـدازەی خشـە خشـێك لای گیانـدارێك نەبێتـە بەڵگـەی ئەسـڵی عیللـەت بـۆی لەگەڵ ئەو گیاندارەدا هەڵیسەنگێنەو ئەنجامەكە ببینە كامیان چاكترە؟!

بەڵێ برا گیان کاتێك ئەم دروست کراوە سەر سوڕهێنەرە فیطرەتی هۆشی دووچاری شێواندن دەبێت لە ئاژەڵی بێ عەقڵ بێ عەقڵ تر دەبێت، وا چاوەڕوان دەکرا، کە مرۆڤ لەبەر هەمو ئەو تایبەتمەندی یانەی، کە ئەوی لە ئاژەڵ جیاکردۆتەوەو بەرزتری کردۆتەوە، ژیانی لەگەڵ ئاژەڵدا نەپێوریێت و زۆر مەزنتر بێت، لە کاتێکدا ڕێگاو شێوازی ڕاستەقینەی تەرك کردو هەوڵی نەدا بۆ گەشانەوەی دروستی هەمو تواناکانی و بەهرە لێ وەرگرتنیان بە باشترین شێوە لەهەر لایەکەوە، کە حیسابی بکەیت زۆر لە گیانداران خوارترەو پوچ ترە.

کە فیطرەتی غەریزەی چەواشە بو شتانێك دەخوات کە هیچ گیاندارێك نایخوات، کۆمەڵێ سیفاتی بۆ دروست دەبێت، کە لەهیچ ئاژەڵێکدا نابینرێت و کارگەلێك ئەنجام دەدات کە هیچ گیاندارێك ئەنجامی نادات، فیطرەتی عەقڵ شێوا هەر بەهەمان شێوە شایەد زۆر خراپتر زۆر گومڕاتر لە حەیوان زۆر پوچ تر دەبێت...﴿بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ (سورة الفرقان: الآية ٤٤)

بۆچی ئاوا پوچ دەبێت؟

ئەو، کە مەوجودێکی مەزن ترە فیطرەتی زۆر بالآترەو توانای گرنگ ترو گەورەتری لەهەمو گیانداران لەبەر دەست دایە،مەبەست هەر ئەوەیە، کە وتمان:

چەواشە بونە لە ڕێگایەك، کە ژیانی تەنیا بەهۆی ئەوەوە ژیانی مرۆڤانەیەو بەبێ ئەوە ژیانی مرۆڤانەی نیەو بەهەمان شێوە، کە بەهۆی چەواشە بونی فیطرەتی غەریزە هێرۆئین، سپرتۆو جگەرە لەلای لە نان و ئاو گرنگ تر دەبێت بەهۆی چەواشە بونی فیطرەتی دڵ –اخلاقیات- ذیللەت و نەنگ و بێ شەڕەفی و ترسنۆکی و بەخیلی و درۆکردن لەبەرچاوی لە سیفاتە چاکەکان چاکترە، بەهەمان شێوە فیطرەتی هۆشی چەواشە دەبێت تا ئەو جێ

یەی، کە بەڵگە نەویست ترین بەڵگە نەویست کە پایەی هەمو زانستەکانە ڕەت دەکاتەوەو ئەمەیە نەخۆشی مرۆڤ.

## پێویست بونی هیدایەت

مەسـەلەی ئیحتیـاج بـە هیدایـەت لەبـەر ئـەو نەخۆشـیانەیە، کـە لەشـی کردنەوەی سێ بەشەکەی فیطرەتدا باسمان کرد، هەندێك دەڵێن، ئەگەر ئیسلام فیطـرەتـە ئیـدی مانـای ڕێنمـایی کـردن و هیدایـەت و ناردنی دیـن و بەرنامـە مانای چی یە؟

ئەگـەر فیطـری بێـت مـرۆڤ دەکەوێتـە سـەر ئـەو ڕێیـەی ئـیتر چ نیازێکمـان هەیە، بە هیدایەت؟

گیانداران و تەنانەت غەیری گیاندارانیش دەبینین تـەواوی دروستکراوەکان بەپێی فیطرەت درێژە بە ژیـان و بـونی خۆیـان دەدەن، یـەك ئـەتۆم بـۆ درێـژە دانی تەمەنی خـۆی تـەنیا بـە داخـوازی فیطـرەتـی خـودا پـێ داوی کـار دەکـات، ئەمە حاڵەتی ڕاستەقینەی هەمو بونەوەرە، بۆچی مرۆڤ وانیە.

مەسـەلەی مـرۆڤ بـەهۆی بـونی عەقڵەوە، کـە خـودا لـەکار وبـارە ئیختیـاری یەکاندا پێی داوە فەرقی هەیە، چونکە مرۆڤ لـە کاروبـارە نائیختیـاری یەکانـدا هەمو وجودی وەکو هەمو مەخلوقاتی تر ساجدو موسەببحی خـوای موتەعالـە، بیەوێت، یان نـەیەوێت مـل کەچـە، هـەمو خانـەو سـێڵەکانی لەشـی، هـەمو تـاڵو ڕەگ و مویەکی لەشی، سەدان هەزار بەشی لە تاڵەکانی موی، بەسـەدان حاڵـەتی جۆراوجۆر و عەجیب و غەریبەوە هەمویان فەرمانبەری خودان، چ پێی خـۆش بێت یان نەء، هەمو گیان لەژێر فەرمانی خوا دایەو بەپێی فیطـرەتـی خـودایی درێـژە بـە ژیـان دەدات، مەسـەلەی ئەمەیـە، کـە لـەنێوان هـەمو ئـەم کۆمەڵـە جـەبرەدا، لـەنێوان هـەمو ئـەم کۆمەڵـە فیطـرەتـە خوداییـەی بونـدا، کـەمێك

ئیختیاری هەیە، کە ئەگەر لەگەڵ کردەوە جەبرییەکاندا هەڵی سەنگێنین وەك دڵۆپێکە نیسبەت بە دەریا.

ئەی مرۆڤ: بیر بکەرەوە کە لە لەشی تۆدا چەند سێڵ هەیە؟

ئەم سێلانە چەند ئەرکی جۆراوجۆریان لەسەر شانە؟

بونەتە چەند بەشەوە؟

هەمو ئەمانە بەپێی فەرمانی خوای خۆیان ئیش دەکەن تۆزێك ئیختیارت پێدراوە، ئایا دەبێت ئەوەندە بچوك بیت، کە لەو ئیختیارە (سوء استفادة) بەهرەی ناڕەوا ببەیت؟

لە ڕێگەیەك کە خوا نیشانی داویت خۆت چەواشە دەکەیت؟

پێویست ناکات کە خوا بۆ بەشی نا ئیختیاری لەشمان و هەمو بونەوەر، کە لەڕێگەی فیطرەتەوە ڕێی نیشان دراوە جارێکی تر بەرنامەو هیدایەت بنێرێت، بەڵام بۆ بەشە نا ئیختیاری یەکەی مرۆڤ – کە بیرکردنەوەو عەقلیشی پێ داوە دین بنێرێت، تێی دەگەیەنێت، کە ڕێگای خێر کامەیەو ڕێگای شەڕ کامەیە حاڵی دەکات کە بەچ ڕێگایەکدا بڕوات کە مایەی سەعادەت مەندی ئەو بێت، مرۆڤ دەسەڵاتی هەیەو دەتوانێت پەیڕەوی بکات، یان یاخی بێت ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ سورة الكهف الآية ٢٩ ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ سورة البقرة، الآية ٢٥٦ بۆ بەشی نا ئیختیاری فێرکردن و حاڵی کردن پێویست نیە، چونکە خۆیان دەزانن لە چ ڕێگایەکەوە بڕۆن، لەو کاتەدا، کە خەوتویت هیچ ویست و ئیختیارێك نیە لەیەك چرکەدا ملیاردەها ئیش لە لەشی تۆدا ئەنجام دەدرێت، چ بزانی و، چ نەزانی دەرفەت و ماوەشت لێ ناگرێ، بێ خەبەری تۆ و بێ ئیجازەی تۆ کارێك، کە بەرژەوەندی ژیانی تۆ لەوەدایە مایەی درێژە پێدانی ژیانتە ئەنجام دەدرێت، تۆ هەواڵت نیە.

تەنها لە بەشێکی بچوکدا ئازادیت پێ دراوە و بۆ ئەم بەشەیە کە هیدایەتی ئیلاهی حاڵیت دەکات چ کارێك باشەو چ خراپ، حاڵیت دەکات، کە ئەگەر بەم

ڕێگەیەدا بڕۆیت هەم بەسودی دنیـای خـۆت و خـەڵکانی تـرەو هـەم بـە سـودی ڕۆژی دواییـت ژیانـت ئـالودە نابێـت و کاتێـك مردیـت قۆنـاغی دوایـی ژیانـت نافەوتێت، بەڵام ئەگەر لەڕێگەیەکی ترەوە ڕۆیشتی هەم بۆ دنیای خۆت و هـەم بۆ دنیای خەڵکانی تر زیانمەندە، پاش مـردن ژیانـت لەسـەر ڕاسـتە ڕێـی خـۆی چەواشە بـوەو گرفتـاری بەدبـەختی و ڕیسوایی و سەرشـۆڕیت دەبیـت، چـونکە اختیـارت پـێ دراوەو هیدایـەتت بـۆ دەنێرێـت ئـەو شـتانە لـەتۆ حـاڵی بکـات، خۆزگە مرۆڤ هێندە عاقڵانە کاری دەکردو لەخۆی نەدەگۆڕاو غرور ئاوا لـە ڕێ دوری نەدەخستەوەو بەو شێوەیە گومڕاو سەرگەردانی نەدەکرد.

ئـاخر ئـەی مـرۆڤ مەگـەر تـۆ چیت، کـە لەبەرامبـەر ڕژێـم و یاسـای خـوا ڕادەوەستی؟

بیربکەرەوە لە خۆت ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ﴾ سورة الانفطار: الآية ٦؟

خەڵکینـە وریـا بـن سـەرگەردان و گـومڕا نـەبن ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ سورة فاطر: الآية ٥

زۆر سـەیرە، کـە بەشـە ئیختیاریەکـەی مـرۆڤ نیسـبەت بـە بەشـە نـا ئیختیاریەکـەی —جـبر- و هـەمو بونـەوەر زۆر زۆر کەمـەو هـەمو بەشـە نـا ئیختیارەکەی بەپێی بەرنامەو ڕژێمی ئیلاهی بەرەو پێش دەڕوات، کە لەو تۆزە ئیختیارو دەرفەتە سودی ناڕەوا ببات و بڵێت: من بەڕێ یەکی تردا دەڕۆم!

ئـەی مـرۆڤ ئـاخر بەدبـەخت دەبیـت و زەرەر دەکـەیت، زیـان ناگەیـەنیت بەخودا، خۆت بێ چارە دەبیـت نـەك تـەنیا خـۆت بەدبـەخت دەکـەیت دەبیتـە مایـەی بەدبـەختی خـەڵکانی تـریش، مرۆڤـەکان بەیەکـەوە پەیوەنـدیان هەیـە، وانیە کەسێك ڕێی بەدبەختی گرت کـار لـە خـەڵکانی تـر نـەکات، یـەك مرۆڤـی خراپ بە ئەندازەی بون و شەخسیەت و دەوری لە کۆمەڵدا بۆ خەڵکانی تـریش ئافەتـەو گـومڕاهی و سـەرگەردانییە، وتمـان، کـە هـەمو مـەوجودات بـەپێی

فیطرەتیان درێژە بەڕێگای خۆیـان دەدەن لـەم نێوانـەدا مـرۆڤ لەبەشـە غـەیری ئیختیاریەکەی خۆیدا دەتوانێت فیطرەتی خۆی بشێوێنێت.

-هیدایەتی دین- بۆ ئەوەیە، کە ئەو کەسە بگێڕێتەوە سەر ڕێی فیطرەت، بۆ نمونە فیطرەتی غەریزە دەڵێت: فلان خۆراك بۆ لەشت پێویستەو بەسودە، ئـاو پێویستە و بەسودە، ئیتر فیطـرەتـت تێـك مـەدە، غـەریزەی خـوا پێـداوت چـاك دەزانێـت کەچـی پێویسـت و بەسـودە بـۆت بـەپێی فـەرمانی ئـەو بجولێـوە، بەعەقڵی شێواو! عەقڵ ڕۆشـنایيە بـەڵام مـرۆڤ لـەخۆی دەکاتـە مایـەی تـاریکی، مەشـروب دخواتـەوە جگـەرە دەکێشـێت، هێـروئین دەکێشـێت، تەنانـەت ئـەو خواردنـە بەسـودانە بەشـێوەیەك تێـك دەدات، کـە زۆربـەیان بەسـورکردنەوە دەگۆڕدرێن بەمادەیەکی ژەهراوی، یان بەلایەنی کەمەوە بێ سـودیان دەکـات بـۆ تەندروستی خراپ.

(( غەریزەی سانەوی)) دروست دەبێت بەهۆی ئـیتراف و خـۆش گـوزەرانی و لەزەت پەرستی و چاوچنۆکی زۆربەی خۆراکە بەسودەکان دەگۆڕێت بە مەوادی ژەهراوی و دەیرێژێتە قورگی خۆیەوە!

هیدایەتی دین بۆ ئەمەیە، کاتێك فیطرەتی غەریزەی چەواشە دەبێت پێـی دەڵێت: بگەڕێوە سەر ڕێی ئەسڵی غەریزەی خوا پێ داوت دەزانێـت، چ پێویسـت و بەسودە بە پێی داخوازی ئو بجولێرەوەو ژیانی خۆت یێ سەروسامان مەکە.

یـان لەلایـەکی تــرەوە – أخــلاق- مــرۆڤ، کــە چەواشــە دەبێــت دەبێتــە مــەوجودێکی زەلیـل و هـیچ و پـوچ و سازشـکار و درۆزن و فاسـیدو بـێ مایـەو نـرخ.

لەبەشـی بـیرو هـۆش دا بەهـەمان شـێوە، کـە وتمـان مـرۆڤ توانـای خـۆی دەشێوێنێت و لەسەر ڕێی ڕاسـت دوری دەخاتـەوە، هیدایـەتی دیـن بـۆ ئەمەیـە، کە ئەم مرۆڤ بانـگ دەکات بۆ سەر ڕێی فیطرەت.

لـەبارەی زەمینـەو بەدیهێنـەرەکانی شێوان و چەواشـە بـونی فیطـرەت، یـان چـین ئەوانـەی مـرۆڤ لـە ڕێـی فیطـرەی غـەریزەو ئـەخلاقیات و هـۆش و بـیر چەواشە دەکات، باس و خـواس فراوانـە لێرەدا مـاوەی ئـەو باسـە درێـژەی نیـە هۆکارەکان و هاندەرەکانی مرۆڤ بەرەو چەواشە بون زۆرە، لێرەدا تـەنیا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەین، کـە خـۆی ئیختیـاری تێدایـە، هۆکـار هەرچـی بێـت ئیختیـار لەدەسـت خـۆی دایـەو دەتوانێـت فیطـرەتـی شـێواو چەواشـە بکـات، دیـن ئـەو کۆمەڵە هیدایەتەیە، کە لەگەڵ فیطرەتی مرۆڤدا سازگاری هەیە، هەمو بەش و لایەنەکانی فیطرەتی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕێگای سەرەکی و ڕاستـەقینە، بـۆ ڕێ یەك، کە تەنیا لـەو ڕێ یـەوەو بـەوەوە مرۆڤـە، هیدایـەت واتـە: گەڕانـەوەی مـرۆڤ بۆ سەر ڕێی ڕاست.

هیدایەت دوو لایەن و ڕوی هەیە:

١- هیدایەتی ئاشکرا – ظـاهري –، کـە ئیشی مرۆڤـە ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ﴾ سورة الشورى: الآية ٥٢

٢- هیدایەتی دەرونی –باطني – کە بەدیهێنانی کارو کاردانەوەیە لە ڕەوانـی مرۆڤدا ( رەوانی هۆشیارو ناهۆشیار یان بـە اصطلاح عربي ضمیر واعـي و ضـمیر غیر واعي ) کە ئیشی مـرۆڤ نـی یـە ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾ سورة القصص: الآية ٥٦، ئـەم جـۆرە هیدایەتـە لەدەسـت مـرۆڤ نایـەت و، زۆر کارێکی گەورەیە کاری مرۆڤ نیە، چونکە ئەگـەر تـەواوی پێغەمبـەران صلی الله علیهم اجمعین- کۆببنەوەو بیانەوێت مرۆڤ لەهـەمو لایەنێکـەوەو بەشـێوەیەکی کامڵ بناسـن ناکرێـت و مەحاڵە، هـەمو مرۆڤایـەتی ناتوانێـت مـرۆڤ بەتـەواوی بناسێت، چ کەسێك دەتوانێت لەبیری مرۆڤێکدا لەو کاتەوە، کە لە ڕەحمدا بوە، تا ئەو کاتەی لەدایك بوە، تا ئێستا چی هەیـەو چی کۆبۆتـەوە، تـا بـەپێی ئـەو زانیاریانە ئەو کەسە بناسرێت؟ چونکە هـەر شتێك کاریگـەری خـۆی هەیـە لـە

ژیـانی مرۆڤـدا، چ بزانێـت و چ نـەزانێت، ژیـان پەیوەنـدی هەیـە بەهـەمو ئـەو شتانەوە كە لەدەرونی هۆشـیارو ناهۆشـیاریدا كۆبۆتـەوە، هەمو پێغەمبـەران — علیهم السلام- نـاتوانن ئـەوەی لـە رۆح و رەوانـی كەسێكدا هەیـە بـزانن كاتێك مرۆڤ نەتوانێت بنەماو زەمینەی شتێك بناسێت چۆن دەتوانێـت بـەر ئـەنجامی داخواز لەو شـتە بەدەست بهێنێت؟ هیدایـەتی ئاشـكرا ئەوەیـە مـرۆڤ ئاگاداری بكەیتەوە، كە فیطرەتی غەریزەت چەواشە كردوە، فیطرەتی اخلاقیاتت خـراپ كـردوە، فیطـرەتـی عـەقلیاتت شـێواندوەو چـاكیان بكـەرەوە، رێگـای چـاكە كردنیشـیان نیشـان بـدە، ئـەم بەشـە ئیشـی ئێمەیـە بەمـەرجێك لەهـەمو لایەنێكـەوە شـیاوی ئـەم كـارەبین و ئەهلیـەتمان ببێـت، بـەڵام بـەدیهێنانی گۆڕانكاری لە هەناوی مرۆڤدا بە شێوەیەك، كە بیگەرێنیتەوە بۆ رێی ئەسڵی و، فیطرەتی سەلامەتی خۆی وەدەست خاتەوە، كـاری ئێمـە نیـەو لـە توانـای ئێمـە بەدەرە... تەنیا كاری خودایە.

پەراوێز:

١) كـاك ئەحمـەد لـە پـەراوێزی ئـەم دەفتـەرە تصـحیح كـراوەدا خـۆی نوسیویەتی بەدەست هێنانی ئەهلیەت و شایستەیی بۆ هیدایـەتی خـەڵكی هـەل و مەرج و زەمینەی فراوانی دەوێت وەكو:

١- هاودەنگ بونی داعی لەگەڵ ئامانج و بەرنامەی دەعوەت.

٢- نیەتی خالص و محەبەت (خۆش ویستن) و دڵسۆزی.

٣- زانیـار بـون و ناسـینی سێ شـێوەی باسـكراوی ئایـەتی ١٢٥ سـورەی نحـل، بەكارهێنانی هەر یەكیان لە جێی خۆیدا.

پرســـیار: دەربـــارەی ئایـــەتی ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴾ ســـورة الشـــمس: ٨ ڕونكردنەوەیكمان بۆ بكەو، چ پەیوەندی یەكی هەیە لەگەڵ فیطرەتدا؟

وەڵام: وتمان، كە فیطرەتی مرۆڤ لەسەر بنەمای ئەو لایەنانە دروست كراوە، كە مرۆڤایەتی مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە دروست دەبێت، هەروەها وتمـان، كـە مـرۆڤ

مەوجودێكە ئازادە — خاوەن ئیختیارەو ڕێگەشی نیشاندراوە، دەتوانێت هەم چاك بێت و هەم خراپ، عیبارەتی- فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا — چەندین عیبارەتی تر لە قورئاندا، كە پێشتر باسمان كرد، عیبارەتی زۆر كورت و گەیەنەری - أمشاج لە ئایەتی- ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ﴾ سورة الإنسان: الآیة ٢ و پاشان ﴿فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ سورة الإنسان: الآیة ٢- هەروەها ﴿إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ﴾ سورة الإنسان: الآیة ٣ هەمو ئەمانە باسی ئەو مەسەلانە دەكەن، كە پەیوەندی بە شەخسیەتی مرۆڤەوە هەیە بەو شێوەیەی، كە هەیەو بەو شێوەیەی، كە دەبێت ببێت، ئەگەر ئیشێك لەتوانای مرۆڤدا نەبێت ئازادی و ئیختیار پێدان شتێكی بێ مانایە، ئیختیار كاتێك ماناداره، كە ئەو ئیشە لەتوانای مرۆڤ بێت، ئەگەر بەكەسێك بوترێت: تۆ ئیختیارو ئازادیت هەیە، كە لەم سەربانەوە بفڕیت و بچیت بۆ مەریخ و بگەڕێیتەوە، دەڵێت: ئەم كارە لە توانای مندا نییە، ئیتر ئیختیارو ئازادیت هەیە — چ مانایەكی هەیە؟ قورئان بە مرۆڤ دەڵێت: ئیختیاری چاكەو خراپەت پێ دراوە، (چاكی و خراپی بە مانای فراوان و گشتی، كە هەمو شتێك دەگرێتەوە، ئیسلام هەمو چاكەیەو كوفر هەمو خراپەیە) یان پێی دەڵێت ئیختیارت هەیە - فألهَمَهَا فُجُورَهَا وَتقْوَاهَا —، - إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ - خوا ئیختیاری بە درۆی نەداوە بە مرۆڤ (وەك ئەوەی لە زەمانی (شا)دا، هەروەها لەم كاتەدا دەڵێن: هەڵبژاردن ئازادە، ئێمە دووكەس كاندید دەكەین و تۆ ئیختیارت هەیە، یەكێك لەمانە هەڵبژێریت!! ئەگەر ڕاست دەكەیت من ئازادم و موختارم بە هیچیان ڕا نادەم، ڕای خۆم دەدەمە كەسێك، كە بەشیاوی بزانم نەك ئەو دووەی تۆ، لە زەمانی شادا دەیانگوت: لە فلان ناوچەدا بۆ پەرلەمان چوار كەس هەڵدەبژێردرێت هەر چواریان دیاری كردبوا! چونكە پەرلەمانی ڕژێم پێویستی بە چوار كەسە و

هەر چۆنێك بوە، ئەگەر بە ئاژەڵیش بێت دەبێت ئەو كورسیانە پڕ بێتەوە، دەبێت هەر چواریان هەڵبژێردرێن!

ئەگەر كەسێكی تر هەبێت وەك ئەم چوارە شیاوبێت!! نابێت ڕای پێ بدەیت، ئەمە ئازادی و ئیختیارە؟

ئەمە چ ئیختیارێكە؟

ئەمە درۆیەو فریودان.

خوای متعال لەگەڵ مرۆڤدا فێڵ ناكات، كاتێك ئیخیتیاری پێ داوی چاك، یان خراپ بیت توانای ئەوەشی پێداویت، بەڵێ بەپێی فیطرەت حاڵی كردویت، كە لایەنی چاكەو خێرو ژیانی ساغ و سەلیمی مرۆڤانە چۆنە؟ بەڵام تواناشی پێداویت، كە بەو شێوەیە، یان بە پێ چەوانەوە بجولێیتەوە، بەپێی غەریزە حاڵی كردویت چ خۆراكێك بۆت چاك و بەسودە بەهەمان شێوە، كە گیاندارانی حاڵی كردوە تۆشی حاڵی كردوە، بەڵام توانای ئەوەشی پێداوی بە پێچەوانەوە بجولێیتەوە هەروەكو باقی مەوجودات نیت، كە نەتوانیت لە ڕێی فیطرەت لابدەی، بیرێ لە دەمی منداڵیی بكەرەوە كاتێك دەیانەوێت فریوی بدەن، یان درۆی لەگەڵ بكەن سەیردەكەیت فیطرتاً ناتوانێت بەو درۆو فریودانە ڕازی بێت بە هیچ جۆرێك دەرك ناكات بە ڕاستی چیەو فریو ودرۆ چیە، بەڵام بە حوكمی فیطرەت ناتوانێت ڕازی بێت پێی.

هەمو دیویانە هەندێك لە دایك و باوكانی نەزان و بێ سەلیقە لەبەر ئەوەی ئەركەكانی خۆیان سوك بكەن، هەر لەسەرەتاوە دێن چەندین مەسەلەی خراپ و شێواو دەخەنە هۆش و بیری ئەو منداڵەوە، نازانن لەگەڵ سیفەتی – بیانوگری- و-پێویست بەغەیری خۆ- ی منداڵدا باش بجولێنەوە دێن درۆی لەگەڵ دا دەكەن، ئەو منداڵە بەڕاستی نیازمەندی كەسێكی ترەو ئەمە سیفەتێكی سروشتی و ئیلاهیەو تەنانەت پێویستە بۆ ئەوەی خۆیان ڕزگار بكەن دەیترسێنن درۆی فێردەكەن لەسەرەتادا منداڵ، چونكە ئەم شتانە لە

فیطرەتیدا نیە فێرنابێت، بەڵام تواناى پێدراوە، فێردەبێت بەهەمان شێوە کە لە فیطرەتیدا نیە هیچ شتێك بیّ هۆکار قبولّ بکات کەچی ئەم دونیایە بە ئەنجامی ڕێکەوت دەزانێت، خوا فیطرەتی مرۆڤی لەسەر بناغەی خێر داناوە بەڵام تواناى هەردو لایەنی خێرو شەڕی پێدراوە -فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا- و زۆر ئایەتی تر بەم مانایەیە.

# دڵی ساز و ناساز

ئاشکرایە، کە مەسەلەی سەرەکی لەهەر بارودۆخێکدا بۆ هەر موسڵمانێکی خاوەن هەست و لێپرسراو ئەوەیە، کە زیاتر لەهەر شتێك ئاگاداری خۆی بێت.

لەڕوانگەی ئیسلامدا چاك کردن و ڕێك و پێك کردنی – ضمیر- و تێك شکاندنی دوژمنەکانی و بەستنی ئەو ڕێگایانەی، کە دەتوانرێت بچێتە ژورەوە لێی، لە دونیای فراوان و ئاڵۆزی– ضمیر- دەروندا – جیهادی اکبرە- کە پایەو بنەمایە بۆ جیهادی اصغر، کە تێك شکاندنی دوژمنە لە دنیای دەرەوەدا – کۆمەڵ- کە هەر چۆنێك بێت بەهەر حاڵ سادەترە لە دنیای دەرون، حاڵ و باری دنیای دەرەوە –کۆمەڵ- لقێك و بەشێکی ژیانی مرۆڤە.

مانای (فلنرجع) یان (رجعنا) لە حەدیسی جیهاد دا بریتی یە لەوەی لەسەرەتای هاتنی پەیامی خوداو کارو بەرنامەی سەرەکی موسڵمانان جیهادی اکبر بوە.

ئەو مەیدانە ئاشکرایەی ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ دوژمندا ( کە دەزانین چ کاریگەری و دەورێکی سەرنویشت سازی لە مێژوی ئیسلامدا هەبوە) وەك کارێکی بچوك و لاوەکی دانراوە، کە دوای کۆتایی هاتنی دەبێت بگەڕێنەوە سەرکاری سەرەکی – واتە جیهادی اکبر-

خاڵێکی تر کە پێویستە ڕونبکرێتەوە، جگە لەو باسانەی دەربارەی – بازنەی مەسئولیەت- کراوە، کە دەزانین مەسئولیەت – پایەی تەکلیفی و دینیە-، کە لایەکی ئەو پەیوەندیە خودی تاکە لێپرسراوەکە خۆیەتی و لایەکەی تری بەپێی گەورەیی و بچوکی بازنەی مەسئولیەتی ئەو کەسەیە لە

خۆیەوە هەوەڵ جار تا دەگاتە هەمو دنیا، منـیش لـەم بارەیـەوە زۆر ئـەدوێم و دەکۆڵمەوە، پێش هەر شتێك پێشەکی یەك.

بۆ ئەوەی زیانەکانی یەك لایەنە بـون دەرکـەوێت و ئافـاتی وەك کەڵەشێری شەڕ لێ دەرچون ڕون بێتـەوە پێویسـتیمان بـە باسێکی زۆرە، بـەڵام ئێستا بـەم ڕونکردنەوەیە واز لەم باسە دەهێنین.

دڵ دوو جۆرە:

١- سالم — ساز-

٢- ناسالم — ناساز- (هەر یەکێکیان بە پلەو ئەندازەی فراوانەوە).

هـەمو ئـەحواڵ و کـردەوەی دەرونـی و دەرەکی، هەنـدێکیان لەگـەڵ سـالم دا سازگارەو هەندێك لەگەڵ ناسالمدا (چ بـە حالـەتی عیللـەت بێـت، چ بـە حالـەتی مەعلولیەت بێت) بۆ نمونە: دڵسۆزی کردن بۆ غەیری خۆت، جا چ بـۆ کەسێك بێت، یان هەمو خەڵك، یان تەنانەت گیاندارێك بێت، نمونەیـەکی تـر ڕوخۆشـی و میهرەبـانی و ئـارامی و سـنگ فراوانــی و سـەخاوەت، لەگـەڵ دڵـی سـالم دا سازگارەو لەگەڵ ناسالمدا ناسازگارە.

١- هەڵبەتــە لەوانەیــە دڵـی کەسـێکی مزکـی جـار جـارو بەشـێوەی کـاتی سەرچاوەی گەورەترین و قورسترین ڕەفتارو هەڵوێستی هاوشـانی دڵـی نـا سـالم بێت لە کاتێکدا ئەمە بۆ ئەو کەسە مایەی پەروەردە بونی زیاتر تێدایە.

٢- لەوانەیە ڕەفتـارو هەڵوێسـتی دڵێکـی نـا سـالم وەکـو ڕەفتـاری دڵ سـالمێك بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە زیانمەندە بۆی و ناساز ترو نەخۆش تری دەکات.

(ئەم باسەی نێوان دوو قەوسەکەی سەرەوە لە جۆری دووەمـی تـەحریکات و فێڵەکانی نەفس و شەیتانە، کە لەم بارەیەوە باسی تایبەتی کراوە.

ئەگەر ئـەو ماوەیـەی ئێمـە بـە جیـدال و مشـت و مـڕەوە خـەریك بـوین بـۆ کەسانێکی پێگەیەشتو هەڵبکەوتبایە.

١- ئەوەنــدە خۆیــان نەدەدۆڕانــد، کــە هــەمو شــتێك فــەرامۆش بکــەن و هــەر خەریکی جیدال بن.

٢- هەمان کاری –جدال- ی دەکردە باس و ڕونکردنەوەی ئیسلامی، کــە هــەم خۆیان پێگەیشتوتر دەبون هەم لە هیدایەتی کەسانی تردا کاریگەر دەبو، بــەڵام ئــەم بەشــە، چــونکە لــە بنەڕەتــدا هاوتــای دڵــی ناســالمە (ئێمــەش ئــەو پێگەیشتویەمان نەبو) بوە مایەی زیانێکی فراوان لە تەبلیغی دیندا، حــەزکردن بە هیدایەت و خۆش بەختی خەڵك بنەمای کارە، بەڵام کەسانێك، کــە –جدل- دەردەچن، ئەو سیفەتە واتە: حەز کردن بە هیدایــەت و خــۆش بــەختی خــەڵك تیایاندا لاوازە، یان لەوانەیە لەناو بچێت وردە وردە هەمان – علم المناظرة- کــە بریتی یە لە –الزام یان افحام خصم- جێی ئــەم ســیفەتە لــە دەرونــی –ضــمیر- مرۆڤدا بە ئاسانی دەرك دەکرێت، هــەروەها جیــاوازی دەورو کاریگــەری بەسەر شەخصــی قســەکەرو بەرامبەرەکــەی زۆر ئاشــکرایە، هــەر چــەند لەوانەیــە لــە ڕواڵەتدا زۆر لێك جودا نەکرێنەوە (ڕونکردنەوەی ئــەم باســە بەتــەواوی لێــرەدا ناگونجێت). بەڵام خۆتــان ئــەو کۆڕانــەی لەگــەڵ نەیارانــدا بومــان بهێننــەوە یــاد بەتایبــەتی مارکسیەکان، بــەڵێ جــار هــەبو چــەند شــەوێك تــا بــەیانی لــەبارەی مەسەلەیەکەوە لەگەڵ کەسێکدا باسمان دەکرد بەبێ هیچ توڕەبون، یــان ئیدانــە کردنێك، بەڵام ئازیزەکانم من لەم دواییــەدا زانــیم و ڕۆحــی مەســەلەکەم دەرك کرد، ئەویش ئەوە بو لە ڕاستیدا ئامانجی دەرونیمــان بوبــوە ئــەوەی مەکتــەب و جیهــان بینــی بەرامبەرەکــەمان بــەتاڵ بکەینــەوە، نــەك هیدایــەتی ئــەو کەســە بکەین، ئێستا ناکرێــت جیــاوازی گــەورەی ئــەم دوو حاڵەتــەتان (بطلان ی ئــەو کەسە یا هیدایەتی ئەو کەسە) بۆ ڕون بکەمەوە، ئەوەی ئێستا دەمەوێت بیڵێم سەرەتا کورتەیەکە دەربارەی پەروەردەو پاشان فێرکردن.

مەسەلەی یەکەم: ئەوەی لێرەدا دەمەوێت باسی بکەم چەند ئاماژەیەکی ترە دەربارەی –دڵ- کــە لــەم چــەند ئایەتــەی خــوارەوە چــەندین حــەدیس بەدەســت هاتوە.

﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ سورة الزمر: الآية ٢٣ پێش ئـەم ئایەتـە ئایەتی ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ﴾ سـورة الزمـر: الآيـة ٢٢ ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ﴾ سـورة المائـدة: الآيـة ٨٣ ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ سورة الأنفال: الآية ٢ ﴿الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ سورة الحج:الآيـة٣٥ هـەروەها چـەند ئایـەتێكی تـر ئەوەیـە كـە دڵـی نـا سـالم لەگـەڵ مڕومۆچـی – گـرژی – و بـێ هەسـتی بەرامبـەر بـە كەسـانی تـرو وشـكی و كینـەداری سـازگارەو دڵـی سـالم لەگـەڵ نـەرم و نیـانی و ڕوخۆشـی و بـەزەیی هاتنەوەو هەسـت كـردن بەئـەرك داری لـە بەرامبـەر كەسـانی تـرو سـەرحاڵی و خۆشحاڵیدا سازگارە.

چەند ساڵێك بێ بەری بون لـەو سیفەتە باشانەو كاروبـاری ڕێـك و پێـك و موبارەك و پـڕ سـۆزو ڕۆح پـەروەر بۆتـە هـۆی پەیـدابونی چـەندەها سیفەت و كـرداری گـەورەی خـراپ و ناپەسـەند ( چ باسـكراو، چ بـاس نـەكراو)، كـە چارەسـەركردنی كـارێكی زۆری دەوێـت و سـەركەوتن بەدەسـت خوایـە، لێـرەدا ئاماژە بۆ چەند دەرمانێك دەكەم:

١. هەوڵ بدەن جار جار كۆببنەوەو بەپێی ئەحواڵی ڕۆحی خۆتـان بەباسـێك لە كتاب و سوننەت یان ژیانی گەورە پیاوان یان باسێكی دڵ ڕاشەكێنی بێ بەش كـراوان و زۆر لێكـراوان كۆڕەكـەتان موبـارەك بكـەن، بـونی فرمێسـك نیشـانەی ناسكی دڵە، باش بزانن هێنانی ئەم چەند ئایەتە لەمەسەلەی یەكەم داو هەمو ئایەتێك ئەوەیە، كە هەڵوێستی ئیمانی لەبەرامبەردا بگیرێـت ئـەویش بریتییـە لەوەی، كە لەكات و حاڵی سازدا تەلاوەت بكرێن و دیارە بیسـتنی هـەر ئایەتێك لە قورئان نابێتە هۆی بەدی هێنانی ئـەم حاڵـە، ڕونكردنـەوەی ئـەم مەسـەلەیە

درێژە،بە ئومێدی خوا بۆ داهاتو. بەڵام مەسەلەی گریان و هاتنە خوارەوەی فرمێسك زۆر لەوە فراوان ترە، كە هەندێك بۆی دەچن بەكورتی گریان لەكاتی مەسەلەیەكی سۆزناكدا هەم نیشانەی سەلامەتی دڵەو هەم دەبێتە هۆی سالم تر بونی لێردا ئاماژە بۆ ئەم دوو مەسەلەیە دەكەم:

١) لەبەرامبەر یەك حاڵەتی سۆزناكی سالمدا ئەگەر موسڵمانێك و غەیرە موسڵمانێك حاڵێكی هاوبەشیان هەبو، یان غەیرە موسڵمانەكە كەوتە گریان و موسڵمانەكە نەگریا، دەستگای دڵی ناموسڵمانەكە بەلایەنی كەمەوە لەم كاتەدا سالم ترە.

٢) ئەگەر مەسەلەیەكی سۆزناكی ساز وەك ئەو مەسەلانەی پەیوەندی بە (قوة غضبية)وە هەیە: درندەترین و خوێن ڕێژترین كەسی هێنایە گریان، لەو كاتەدا بە ئەندازەیەك دڵی سالم دەبێت كە ناتوانێت بچوكترین تاوان ئەنجام بدات (درێژەی ئەم باسە بۆ فرسەتێكی تر بە ئومێدی خوا ئەگەر ماین و نەمردین ).

٣- وردە وردە شەو بەسەربردنی عادەتتان بگۆڕن، شەو زۆر لەبارو شیاوە بۆ دووكاری بەدەنی و ڕۆحی ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ﴾ سورة غافر: الآية ٦١، كە ئەم (سكون)ە هەمان (سەبات)ی ئایەتی﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾ سورة النبأ: ٩ یە + ﴿قُمِ ٱلَّيْلَ﴾ سورة المزمل: الآية ٢ تا ﴿وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ سورة المزمل: الآية ٦. زۆر حەیفە كە زۆرترین كاتەكانی شەو دابین كەری سەلامەتی ڕۆح و بەدەن نەبێت، بەكار بهێنرێت بۆ شتی كەم بایەخ یان بێ بایەخ.

هەوڵ بدەن بەرنامەتان بەجۆرێك بێت، كە نوێژی عیشا لەسەرەتای شەو بكەن و باقی كاتەكانی تر تایبەت بكەن بە خەو تیلاوەتی قورئان و تەهەجود، ئەگەر پێویست بكات بۆ ئیش و كاری لەم بابەتە بەكاربهێنن.

بــــەڵام دەزانـــــن لەیــــەك ڕووەوە ســــەیركردنی ئــــەحكامی ئیســــلامی و هەڵسەنگاندنی كاروبار بەكێشانەی چەندێتی باویتی و زۆربەی جار كێشانەی

چۆنیەتی –کیفی- شتێکی ناوازەیەو تەنیا مقیاسێکی چۆنیەتی –کیفی- کە ڕەواجی هەیە بریتی یە لە ڕەزای خودا.

گەلێك جار گرنگترین عیبادەتی مرۆڤساز واتە نوێژ لەبەر خاتری کاروبارێك دەگۆڕێت یان هەرناکرێت، کەواتە ئەگەر جار جارێك کارێك دێتە پێش، ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا کەم بایەختر (وەکو خزمەتێکی مەعنەوی یا مادییە کەسێك چۆن بۆ میوانداری کەسێك، یان ڕاگەیشتن بەخێزان ومنداڵ و کەس وکارو نیشان دانی خۆشەویستی بۆیان) ئەگەر نیەتتان خودا پەسەند بێت بێ هیچ بێ تاقەتی وگرژبونێك بەرنامە پێشوکەتان تێك بدەن، مەسەلەی کۆڵ کۆڵەکانێی رسول (ﷺ) بهێننەوە یاد، یان هەڵبەزودابەز کردن و یاری کردنی منداڵەکانی عمر (ﷺ) لەسەرپەرشتی باوکیان و داڕندنی فەرمانی پارێزگاری ئەو کەسەی بڕیار بو ببێتە پارێزگاری، یان جەعفەری صادق(ﷺ) کە چۆن چەند سەعاتێکی لەشەودا تەرخان کرد، بۆ باس و لێکۆڵینەوە لەگەڵ مولحیدێکدا –مادی-.

٣- دەربارەی -اذکار موجە – ئەم چەند تێبینی یە دووبارە دەکەمەوە.

یەکەم:

لەبارەی ڕابردووەوە زۆر قوڵ و بێ پەردەو سنور بیربکەنەوە دەربارەی بەرئەنجامی چەند ئایەتێك لەم بابەتە ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ سورة القيامة: ٣٧ تا خۆمان بە دروستی بناسین و دوچاری گومانی غافلانەی وانەبین، کە گوایە من هەر ئەم منەی ئێستا بوم و بە لەخۆڕازی بون و خۆ پەسەندی و فرو فیشاڵ کە بکوژی دڵ و پەروەردە کەری عجب و غرورە خۆمان سەرقاڵ بکەین.

دووەم: بزانین کە زەمینی ئێمە لە مولکی گەورەی خوادا چەندە بچوکە؟ ئێمەش لەسەر ئەم زەمینە چەند بچوکین؟ خوا دەتوانێت لەهەر ساتێکدا بە حیسابە خەیاڵی یەکانی ئێمە کۆتایی بهێنێت، یان چەندین بەلای وا بێنێتە

پێشەوە بۆمان کە سەرئەنجامەکەی مردن بێت یان مردن نەبێت و ئاسایی بێت.

بۆ نمونە ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾ سورة سبأ: من الآية ٩ هاوکات حاڵی ببین و دەرک بکەین هەر ئێستا خوا دەتوانێت ئەم عەرزەی ژێر پێمان بقلیشێنێت، یان ئەم بنمێچەمان بەسەردا بڕوخێنێت، بەڵام ئەگەر نەیەوێت بمرین بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە سەختترین ئەشکەنجەو ئازار بەو پەڕی بێ توانایی بمێنینەوە.

سێ هەم: بەدڵ و بەبیر تێ بگەین لە مانای ئەم ئایەتانە ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ سورة الجمعة:(٨)، ئەو ئایەتانەی جیاوازی مەرگی پاکان و ناپاکان و ئایندەیان دەردەخات.

چوارەم: مانای ئەو ئایەتانە لە دڵی خۆماندا بناسین ﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ (سورة غافر: الآية ٣٩) ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ (سورة البقرة: الآية ١٦٨) ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ (سورة لقمان: الآية ٣٣).

بە ئەندازەی جوتیارێك بۆ مەڕو ماڵات و باغ و بێستانەکە بۆ خۆمان دڵسۆز بین و ڕابردومان هەڵسەنگێنین کە: چ شتێك سود مەندو کاریگەر بوە لە بەرژەوەندی و نەش و نمای ئایندەمان و کامەیان نەبوە؟

دیسان دوبارەی دەکەمەوە، ئەگەر خۆ پەرستین، بزانین بە چ شێوەیەك؟

بە شێوەیەکی دروست خۆمان بوێت و خۆمان خۆش بوێت، نەك خیانەتێکی وا بکەین سەبارەت بە خۆمان کە دووژمنەکانمان لە دەستیان نەیەت.

٤- وریابن کە ڕێگاکانی وەسوەسـەی شـەیتان جۆراوجـۆرە ئەگـەر کەسێك لـە کۆمەڵێك کارو سیفەتدا بە پلەی —اطمئنان-گەیشت نابێت گومان بکات بەسەر نەفسی خۆیـدا زاڵ بـوەو لـەژێر هـیچ فشـارێکدا نالـەرزێت تەنانـەت، ئەگـەر لەسیفەتێکدا شورەی قەلایەکی لـە گـرتن نـەهاتوی تقـوی بـە دەوری خۆمانـدا بکێشین لەوانەیە هەر خودی ئەم گومانـە ( بەدەست هێنـانی اطمئنـان) ببێتـە دەلاقەیەك بۆ شەیتان، تـا لێـرەوە ژەهـری کوشـندەی —عجب- بڕێـژێت بەسـەر دڵماندا، کە ئەم گومان و پەندارو ڕافەرمونە لە گوناهەکە خۆی زیان مەنـدترە، فەرمودەیەکی حەزرەتی جواد ئەم مەسەلەیە جوانتر ڕوندەکاتەوە، کـە دەڵێـت: ( گوناهێـك کـە مـرۆڤ هەڵـدەنێت و ناچاری دەکات بـۆ ئیسـتیغفار چاکترە لـە تقوای —عجب- بەدی هێنەر).

٥- دیسـان چـەند وشـەیەك لـەبارەی سـەلامەتی دڵەوە، بـەڕێك وپێکـی بـیر بکـەرەوە لـەناوەڕۆك و ڕازی ئـەو ئایـەت و حەدیسـانەی کـە سـەلامەتی دنیـاو ئاخیرەت بە بەرهەمی سەلامەتی دڵ دەزانن، پاشـان لـەبارەی ئـەو کاروبارانـەی، کـە دەبنـە هـۆی سـەلامەتی دڵ و لەگـەڵ دڵـی سـالم دا دەگـونجێن (کـە چـەند نمونەیەکمان وەك مشتێك لەخەروار هێنایـەوە) خـاوەن هەسـت و لێپرسـراوانە بیر بکەرەوەو ڕابمێنە لێی ئەو شتەگرنگ و وردەشت نـە بـیر نەچـێت بـەپێی — نیـەت — جـار هەیــە گـرنگترین ڕەفتـاری سـالم و سـاز گـەورەترین زیـان دەگەیەنێت، بەپێچەوانە کۆمەڵێ ڕەفتاری نا سالم دەبێتە مایەی سـەلامەتی دڵ (بەلام نەك وەك ئەو شێوەیەی نیازی یـەکان بـۆی دەچـن نـەك وەك ئـەوەی لـە سەفسەطە بازی — مەلامی گەری — دا هەیە، کە تـاوان کـردن بـە ئاشـکراو خـۆ بە فاسق نیشان دان لە دوچاری هەندێ تاوانی نهێنـی خـراپ تـرە ) (مەسـەلەی گوناهی تاکی بۆ تاك، یان بۆ تاك و کۆمـەڵ، یـان گونـاهکردن بەرامبـەر کۆمـەڵ لـە باسـەکانی — پلـەی دووەم و سـێ هـەمی — فریـوی نـەفس و شـەیتاندا ڕونکراوەتەوە دەتوانیت سودمەند بیت بۆ حاڵیبونی ئەم مەسەلەیە).

بەدەست هێنانی –ملكە- پێویستی بە هەوڵدانی بەردەوامە، ئەگەر هاوڕێی باش و ڕێك و پێك دەست بكەوێت زۆر بەكەڵك دەبێـت (خۆشەویستی هاوڕێی ڕاست ودروست لەسەر پایەی –تقوی- لە ئایەتی ١١٩ سورەی تۆبـەدا بـاس كـراوە و بەشێك لە تورەبون و جدال (بە مانا عورفی یەكەی) دوشتن، كە لـە نـا سـالم كردنـی دڵی كەسـانی نـا كامـڵ كاریگـەری فراوانیـان هەیـە هـەروەها ئـەو سـێ دەردەی لە ئایەتی ١١ ی سورەی حجراتدا بـاس كـراوە لـە تـورەیی زیانمەنـدترن، زۆر وریا بن: لە باس و خواست لەگەڵ یەكتردا هەروەها لەگەڵ باقی موسڵمانان چ بەشێوەی نامە چ ڕوبەڕو (جا چ حكومەت بێت یا نـەبێت ) تەنانـەت لەگـەڵ غەیری موسڵمان و ئەندامانی گەورەو بچوكی ئەو حـزب و دەسـتانەی دەسـتیان بە خوێنی سەدان كەس لە ئازیزانمـان سـورە، لـە پەیـدابونی ئـەم جـۆرە شـتانە ڕێگری بكەن.

لەهەمو ئەركەكانماندا وێڕای – ئەمرو نـەهی تـەعاونی- تەوصیە بەهـەق و تەوصیە بە سەبر بكەن و سەرنج بدەن لەكاتێكدا ئەمرونەهی دەكەن نیـەتتان سالم بێـت، یـا تێكـەڵی شـتێكی دڵ كـوژت نـەبێت، كـە دەبێتـە مایـەی زیـان بـۆ خودی – ئامرو ناهی یەكە-.

لـەبارەی – كینـەوە – پێویسـتە، كـە ئاماژەیـەك بكـەم بـزانن تەنانـەت لەبەرامبەر ئەندامانی ئەو حزبانـەی، كە خۆیـان بـە دوژمنمـان دەزانـن نابێـت قینتان هەبێت و ڕق و كینەتان لـە دڵ دابێـت، ئەگـەر خـوا ڕێكـی خسـت ڕونـی دەكەمـەوە – تـبري- كـە لـەزۆر ئایەتـدا بـاس كـراوە لـە (جەدوەلـەكانی كتێبـی دەربارەی كوردستان دا) بە شێوەیەكی گشتی باس كراوە، لەگەڵ كینـەدا فـەرقی هەیە تەنانەت – تبري- بۆ زیندو زۆر جار خێرخوازی یە نەك هەر ڕق، بـەڵكو لـە ڕوداوی – اعراضـي- یـونس دا (عليه السلام) حـاڵی دەبـین تەنانـەت –اعـراض- بـۆ كەسانی بە تواناو لێپرسراو لە باس و تەبلیغ دا نابێـت بكرێـت، بـەڵام لـەبارەی موسـڵمانان چ بەتـەقوا، چ گوناهكـار مەسـەلەكە جـۆرێكی تـرە (لـە ئایەتـەكانی دوعاوئیسـتیغفار ورد بـەرەوە) دڵنیـك، كـە دەربـارەی موسـڵمانی گوناهكـار ڕق و

كينەی تێدابێت هەرگیز ناتوانێت بە سالم و بێ گەردی بمێنێتەوە، ناڕێكی وناكۆكی لە مەسەلەیكدا نابێت ببێتە مایەی قینەكێشان و ڕق لێ بون، چونكە زیانی ئەم كینەو ڕق لێ هاتنە بۆ ئەو كەسە خۆیەتی، كە حقدی هەیە نەك ئەو كەسەی تر.

ئەگەر كەسێكمان خۆش بوێت بە ئاسانی لەكەس وكاری دەبورین، ئەگەرچی زیانمان لەدەستیان دی بێت، كەواتە تۆش لەهەر جەژنێكدا لەبەر خاتری خۆشەویستی خواو خەڵك – محمد- ﷺ، تەواوی ئەو كەسانەی لە ئوممەتی ئەون ببەخشەو ئازادیان بكەو صادقانەو موحیببانە دوعای لێخۆشبونیان بۆ بكە (بەتایبەتی دوای مردن).

هەڵبەتە ناكۆكی و حسابی ماڵیی شتێكی تایبەتی یە مەگەر مەسەلەكە لە بابەتی ﴿وَأَن تَصَدَّقُواْ﴾ سورة البقرة: الآية ٢٨٠ بێت.

باشی و سازی نیەت سەرەڕای لایەنە دنیاییەكان دەبێتە مایەی سۆزو لێ خۆش بونی خواش لەئێمە، دەزانین مەسەلەی –افك- چ پیلانێكی گەورە بو لەلایەن مونافقینەوە دژی ئیسلام و محمد (ﷺ)، بەشداری كردنی كەسانێك لە موسڵمانان بەباسكردنی ئەو مەسەلەیە، یان بەلایەنی كەمەوە بەدرۆنەخستنەوەی ئەو مەسەلەیە چەند هەڵەیەكی گەورە بوە لەگەڵ ئەمەشدا وردبنەوە لە ئایەتی ڕۆح نەوازو دڵ پەروەری قورئان دەربارەی خەم و بێ تاقەتی ابوبكر(ﷺ) كە بەهۆی ئەو مەسەلەیەوە بڕیاری دا ئینفاق نەكات بەو كەسانەی لەم مەسەلەیەدا بەشداریان كردبو، لەم ڕستە ئومێد بەخشەدا دەفەرموێت: ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ سورة النور:الآية٢٢.

ئازیزانم زۆر لێبڕاوانە كۆشش بكەن ڕیشەی هەمو جۆرە –غل- و كینەیەك دەربارەی هەر موسڵمانێك باش، یان خراپ و مردو، یان زیندو لە دڵتاندا دەربهێنن ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ﴾ (سورة البقرة: الآية ٢٨١).

٦- هۆشـيارانەو لێبڕاوانــە خۆتـان بپـارێزن لـەو شـەش نـەهی لـێ کـراوەی (منهيات ست) ئايەتەکانی ۱۱ و ۱۲ ی حجرات کە بەداخەوە هەنـدێك لەوانـە لای هەندێك کەس بۆتە شتێکی ئاسايی، ئەو فەرمودەيەی عباس دەربـارەی تـەقواو خۆپاراسـتن لەنــەهی کراوەکـان بهێننــەوە يادتــان لەکاتێکـدا لـەلای مرۆڤـی تێگەيشـتو هـەمو شـتە نـەهی کراوەکـان زيـان مەنـدترن لـە دڕك و داڵ و مـارو مێروو دێو و درنـج.

٧- شـۆخی کــردن – سـوعبەت- بــەو مەرجانــەوە، کـە هەيـەتی شـتێکی بايەخـدارە لەڕەوشـتدا ئيسـلام وشـکە موقەدەسـی و ژيـان و پەيوەنـدی وشـك پەسەند ناکات ئەو قسەيەی عمـر (ﷺ) کـە دەفـەرموێت: (لا تمـت علينـا ديننـا اماتك الله)، کە بـە موسـڵمانێکی هەميشـە بـێ دەنـگ و مڕومـۆچ و گۆشەنشـينی وت..

بهێننەوە يادتان ئەو شۆخييانە (يـانی چ بـە قسـە چ بـە کـردەوە دەيکـردن) وەکـو (امـا تـرك ذلـك الجمـل الشـداد، بعـد؟) وە هـەروەها مەسـەلەی خورمـا خــواردنێکی لەگـەڵ علـی(ﷺ)کـە لـەم هـەڵس و کـەوت و ڕەفتارەيـەوە بۆمـان دەردەکەوێت لەگەڵ يارانيدا چۆن جوڵاوەتەوە، بەڵام وريابن کە:

أ) ئەو قسەيە يان ئەو کردەوەيە موباح بێت.

ب) ئامــانج دار بێـت واتــە بـۆ ناسـينی کەسـێك و کردنــەوەی پەيوەنـدی لەگەڵيدا يان لابردنی دڵ ئێشان و پەرێشانی خـەياڵی ئـەو کەسـە يـان تێکدانی ئەو دۆخە خراپە زاڵ بوە بەسەر دانيشتنەکەدا بێت يان بۆ بڕينی قسەو باسی ناپەسەند بێت يان دەربڕينی خۆشەويستی و سۆزێکی تايبەتی و بـۆ کەسـێك و زۆر نمونەی تری لەم بابەتە.

نەك شۆخی هيچ و پوچ کە زۆرکردنی مرۆڤ پوچ دەکات –مزاح-ت دەکات.

ج) وريـابن و زۆر وردبـن ئـەو شـۆخی يـە هـيچ ئـەنجامێکی نـا پەسـەندو نـا هەموار نەگەيەنێت بـەخۆت و يـان کەسـێکی تـر، دانيشـتن وحـاڵو بـاری ڕۆحـی کەسێك تێك نەدات.

٨- دەزانن کە ئیستیکبارو ئیتراف دوو تایبەتمەندی سەرەکی دوژمنانی دیـن و مرۆڤایەتین، چ لە دەرون و ناوەوەی مـرۆڤ، وەك تـاك، چ لـە ئاستی کۆمەڵدا (ڕەگ وڕیشـەی سـەرەکی ئـیتراف ئیسـتیکبارە، بـەبێ ئیسـتیکبار کـەمتر خۆشەویستی و حەزی دام و دەزگاو سفرەو خوانی ڕازاوە پەیدا دەبێت، ئەگەر ئیستیکبار نەبێت دەست هەڵگرتن لـە ئـیتراف ئاسانە ) ئیسـتیکبار لـە کرۆکدا تایبەتمەندی یەکی دەرونی یەو ئەوەی لە ڕواڵەتدا دەیبینین بەرئەنجامی ئەوە، گەواتە سەرکوتکردنی لە ڕێگەی جیهادی ئەکبەری ڕاستەوخۆوە دەبێت، بـەڵام هـەنگاوێکی وا تواناو ڕێنماییـەکی کاریگـەری دەوێـت ئێمـە دەتـوانین بـۆ وشـك کردنی لق و پۆپی دارێك هێرش بەرینـە سـەر ڕەگ و ڕیشـەکەی، بـەڵام بـزانن، کە: لق و پۆپەکانی ئیستیکبار فراوانـە، چ گـەورەو ئاشکرا، چ نهێنـی و بچوك، لەوانەیە لە پەیوەندی یەکانی خێزاندا (باوك و دایك و ژن و مێرد و خوشك و براو گەورەو بچوك)و لەگەڵ ئاشناو دۆستان و هاوکارو هاوپۆلانـدا، یـان لەگـەڵ کەسەبەو بازاڕیدا، یان لەگەڵ ڕێبوارو خەڵکی سەر شەقام و جادەدا، چ بە قسە، یان جوڵانـەوەی ئەنـدامێکی لـەش، یـان سـەیر کردنێـك سیفەتی ئیستیکبارەی خۆی دەربخات و بێتە مەیدان.

ئێستا ماوە نی یە بە درێژی باسی بکەین تەنیا بەشێك لە عـەلی یـەوە (ﷺ) فێـربن بـە زمانێـك، کـە زمـان حـاڵی دڵ بێـت لـە خـوا داوا بکـەن، کـە: اجعلني بقسـمك راضـياً قانعـاً، وفي جميـع الاحـوال متواضـعاً سـنگ فـراوان، ئەگـەر هۆشیارانەو دەرونی ڕەفتاری بێت ژەهری سەرەکی ئیستیکبارە، بەڵام لەکاتێکدا ئەگەر دەسەڵاتی دەرونی زۆر نەبێت دەتوانین لە ڕێگەی سنگ فراوانـی ڕواڵـەت دوژمن لە دەرونەوە ئاگر باران بکەین، والله ولی التوفیق.

دوای بەدەست هێنانی ئەندازەیەك لە دەسەڵات لـە بەرامبـەر ئیسـتیکبارەوە جـەنگی ئیترافـیش دەسـت پـێ بکـەن، پلـە بـە پلـەو لەهـەمو لایەنێکـەوە بەمـەرجێك گونجـاو بێـت لەگـەڵ توانـاو بـاری تایبـەتی ئـەو کەسـەدا، دیسـان هۆشیار بن، کە ئیسلام سەرپێی و لەیەك لایەنەوە سەیری دەرمانی دەردەکانی

مـرۆڤ ناكات، لەوانەیـە لەكاتێكدا قسـەیەك، یـان هەڵوێسـتێكی دژی ئیسـراف و تەبذیر گوناهێكی زۆر خەتەرناك تر بێت لە خودی ئیسراف و تەبذیرەكە یان خۆپاراستن لە جۆرێك ئیسراف ببێتە هۆی تەبذیر.

٩- بەڵام شتێكی تر، كە زۆر گرنگە، كە ڕۆحی موسڵمانیەتی و ژیانی و بونی —جیهادی اكبر- هەروەها جیهادی اصغر- وبنـەڕەتی پەیوەنـدی مـرۆڤ وخـودا و تەنیا نیشانەی بـاوەڕێكی هۆشـیارو كاریگـەرەو بـەبێ ئـەو شـتە بـاوەڕ نـەمانای هەیەو، نە واقعیەت لە ڕەفتاردا دوعایە، دوعـا ڕۆح و مـۆخی نوێـژەو نوێـژیش تەنیا ڕێگەی پەیوەندی ڕێك و پێكی خواو خەڵكەو نـاهی فەحشـاو مونكەراتـە، ئەگەر خوا یارمەتیمان بدات دەربارەی دوعا دەبێت باسـی زیـاترو كـاری زۆرتـر بكرێت بۆ بەدەست هێنـانی شایستەگی دوعـا كـردن، بـەڵام ئـەوەی لێـرە دەبـێ بوترێت ئەوەیە كە:

یەكـەم: دوعـا دەبێـت بـەپێی هیدایـەتی نەبـەوی لـە قـوڵایی دڵـەوە بێـت، هەمومان بە گشتی و خوشك و برایـانی ئـازیز، كە زیـاتر لـە خـەڵك خـەریكی دوعاو زیكرو وێردن وریابن، كە ئەوەی بە قسەی علی (ﷺ) (لقلقـه اللسان- ەو لـە قـوڵایی دڵـەوە نییـە لـە ڕاسـتیدا هـەر دوعـا نییـە، دوعـا كـارو هەڵوێسـتی هۆشـیارانەی دڵـە بـۆ جێگیركردنـی مـرۆڤ لـەو سـەنگەرەداو ئـەوەی بـە زمـان ئـەیڵێت: بریتیـە لـەوەی لـە دڵدایـە و هـەمان بایـەخ و ئەرزشـی هەیـە، كـەوا لەوێشدا هەیە (ان المعاني في الفؤاد وانما جعل اللسان على الفؤاد دليلا) مـرۆڤ و تـــەواوی دروســـتكراوەكانی خیلقـــەت بـــە شـــێوەیەكی بـــەردەوام بـــۆ مانـــەوەو چالاكیەكانیان لە خوا داوای یارمەتی دەكەن، هـەمو بـەش ولایەنـەكانی بونمـان بەپێی دەسەڵات و ویستی خۆمان بە بـەردەوامی لـە مبـدا فیـاض —خلق وامـر- بەهرەو بەرەكەت وەردەگرن، ئێمە لە ڕێگەی دوعاوە بونی ئیختیاریمـان لەگـەڵ باقی بەشەكانی تـری لـەشمان و لایەنـە گـەورەو بچوكەكانی بونـەوەر هاوڕێگە دەكـەین و لایەنـە هۆشـیارو موختـارو ئازادەكـەمان دەخەینـە سـەر ڕێگـەی

شایستەی خۆی، کەواتە ئەوەی دەیڵێین: بە زمـان کاتێك شـایەتی ئەمەیـە پێـی بوترێـت: دوعـا، کـە هـەمو لایـەن و بەشـە موختـارو نـا موختارەکانی نـاوەوەو دەرەوەمان بەشداربن تیایدا کە مل کەچی و سەردانەواندن بۆ خـودا ڕواڵـەتی دەرەکی و دەرونـی ئـەم بەشـداری یەیـە، وە تـەنیا لـەم حاڵەتەدایـە کـە دەبێـت چاوەڕوان بین بە زوبی بەئەنجامی دەرونی و ئاشکرای ئەم دوعایە ببینین.

١) ئامـان لـە زەمزەمـەی وتنـی وشـەو قسـەی تـەنیا کـە موسـی کـاظم دەفـەرموێت ( مـن اسـتغفر بلسـانه ولم یسـتغفر بقلبـه فقـد اسـتهزأ بنفسـه) چ شۆخی و ئیستیهزایەکی بیّ جیّ و زیانمەند.

٢) بۆ پەیوەستەگی نێوان زمان و بونی دەرونـی (وجـود بـاطني) و تەنانـەت وجود ظاهري دەبێت چەند کەرەستە بخەینـە گـەڕ، کـە گرنگترینیـان ئەمەیـە: جگە لە نوێژ و چەند دوعایەکی تر، کە وشەو واژەکانیـان گرنگی خـۆی هەیـە، بە زمانی خۆت، یان هەر زمانێکی تر، کە باش دەیزانیت دوعا بکەن، ئەگەر بە زمانی عەرەبی کـە زمـانی دوعـای (مـأثور و منقـول)ە ئاشـنا بویـت لـە حاڵـەتی ڕوحی لەبار بەپێی حاڵ و باری خۆت، هەوڵ بـدەن فێـربن دوعـای ئـەو گـەورە پیاوانەی، کە بەهۆی پەیوەندی ڕۆحی لـەبارو هاوڕێگـە سازی کیـانی هۆشـیارو موختـار لەگـەڵ هـەمو جیهـانی بونـەوەردا بەڕاسـتی ئـەهلی –دوعـا- بـون و لەهـەمو جـۆرە حاڵـەتێکی ڕۆحیانـدا دەرکیـان دەکـرد، چـۆن نیـازو داخوازیـە دەرونی و دەرەکیـەکانی خۆیـان گـەش بینانـە بناسـن و پاشـان بـە سـازگارترین واژەو شایستە ترین شێوە نیازەکانیان لەخوای پەروەردگار داوا بکەن، بۆ نمونـە موسی کلیم(ﷺ) لە چ حاڵێکدا و بـەچ شـێوەیەك ئیسـتیغفار دەکـات ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي﴾ (سـورة القصـص: الآيـة ١٦) یـان پەناگـەو هێزێکـی نـەمر داوا دەکات، ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ (سورة القصص، الآية ٢٤).

یـا لەدەسـت سـتەمكارانی سـەردەمی خـۆی شـكات دەكـات ﴿أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ مُّجۡرِمُونَ﴾ (سـورة الـدخان: الآيـة ٢٢) يـان ايـوبی خۆشەويـسـت و ئـازيز (عليه السلام) دوای تەحەمول و تاقەتێك دڵە موبارەكەكـەی لـە نالـەباری طاغـوت و طاغوتيـەكان دەڕەنجێت و دەستی نيـاز بـەرز دەكاتـەوە ﴿مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ﴾ (سـورة ص: الآية ٤١) گرفتار بونی بە بەڵای ئيلاهـی بـە بەرئـەنجامی پـەيڕەوی خـۆی لـە وەسوەسەی شـەيتان حيساب دەكـات، پاشـان چـەند بـە ئـەدەب و ئـارامی ڕۆح و ڕەوانـەوە ئومێـدو هيـوای بـە سـۆزو بـەزەيی خـوا داوا دەكـات ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (سـورة الأنبيـاء: الآيـة ٨٣)، هـەروەها دوعـا مـأثـورەكـانی محمد(ﷺ) وەكو سيد الاستغفار، يان دوعای خاتو فاطيمة (g) ((اللهم يا حي يـا قيـوم)) دوعـای بـاقی گـەورە پيـاوانی خـاوەن ئـيرادەو (خـۆ)، كـە لـەكتێب و ديوانەكاندا هەن سود وەربگرن، وەك هەندێك لە دوعاكانی قصيدەكانی بڕئيەو همزييەی ئيمامی بوصيری و هەروەها ((صحيفة سجادية))ی زين العابـدين، كـە لە ڕاستيدا سەرچاوەيەكە لە حيكمەت، گرنگترين دوعاكانی صحيفە بريتـی يـە لە (( تۆبە، ئيعتراف، ئيستغفار، تذلل، رهبت، حالت ماتم)) و چـەند دوعايـەكی تر.

((حزب الـدور الاعلـى)) ی محی الـدين عرەبـی و دوعـای كومـەيل و هەنـدێ دوعـاو سـەڵاواتی –دلائـل الخـيرات- بـەڵام عاشـقان و ئـەهلی دوعـا دەزانـن، كـە لەوايە:

١- لە دوعايەكی درێژدا بڕگەيەك، يان چەند بڕگەيەكی تێدابێت، كە لەگەڵ حالەتی ئەو كەسەدا دەگونجێت.

٢- جار هەيە لەگەڵ ئەوەشدا حالـەتێكی گونجـاوت هەيـە، توانـاو شايستەگی هەنـدێ دوعـا لەخۆتـدا شـك نابـەيت، بـۆ نمونـە قسـەيەك دەگێڕمـەوە لـە پيرەمێردێكی زيندو دڵ و ڕەوان گەش، كە لەو ساڵانەدا، كە لە تاران بـوم پـێش

ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵیدا ئاشنابوم (ئەم پیاوە لەسەرەتای دانانی دادگادا لە سنە بوە لەگەڵ خوالێ خۆش بو مەلا عبدالله موفتی دشەیی دۆستی و نزیکی هەبوە) بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر چۆتەوە، لەگەڵ ئەوەدا زۆر ئازیزە لەلام، ئەم پیاوە دەیوت هەر کاتێك دەمەوێت ئەم دوعایە بخوێنم، بەڵام لە دوو دێڕی دووەم دا زۆر شەرم دەکەم:

يا من بك حاجتي، روحي بيديك

عن غيرك اعرضت، اقبلت عليك

ما لي عمل صالح استظهر به

قد جئتك راجياً، توكلت عليك

مـن ئـەو کاتـە لـەم قسـەیە بـاش حـاڵی نەئـەبوم، ئێسـتاش، ئەگـەر وەك شایسـتەیە حـاڵی نـەبم بەلایـەنی کەمـەوە دەتـوانم دەرسـێکی لێ وەربگـرم، مەبەستم لەم کورتەیە ئاشکرایەو حاڵی ببن مەبەستم چی یە.

دوای ئەم باسە شتێك، کە زۆر جاری تر وتومە دووبارەی دەکەمەوە کە قسەو عیبادەتی پاکان مەکە بە قیاس بۆ خۆت لەبەر ئەوەی قسەو کارو کردەوەکانیان لە دەرونێکی هێندە ڕۆشنەوەیە، کە لەگەڵ دەرونی تاریك و مەشغول عنە ئێمەدا زەوی تا ئاسمان جیاوازی هەیە، ئەگەر ئەم شتە لە بارەی پاکانەوە نەزانین قسەو عەمەلیان وەك قسەو کردەوەکانی خۆمان بێ پێزو بێ مانا دەنوێنن (بەڵام ئامان ئەهلی مەعریفەت و تصوف تێکەڵ نەکەن و بەهەڵەدا نەچن).

٣- بەتێڕوانین لە خاڵی پێشو و ورد بونەوە لێی دەتوانین ئەمەش بەدەست بهێنین، کە ((دیاری کردنی شێوەی تایبەتی)) لە دوعادا، جگە لەو کاروبارانەی دین ڕێگەی داوەو دیاری کردوە، وەك ئەو ڕێگە وایە، کە کوێرێکی نا شارەزا بەچاو ساغێکی شارەزای نیشان بدات، جا ئاشکرایە، کە ئەم شتە چەند نامەنطقی و نا دروستە، لە دوعاکانی پێغەمبەری گەورە ﷺ وەك ئەو دوعایانەی دوای تەرکی طائف دەیوت یان ئەوانەی قورئان لە زمانی ئەوەوە

باسیان دەكات، لە دوعاكانی پێغەمبەرانی تر (ﷺ) لە كات و شوێنی جیا جیادا كردویانە، ورد بنەوەو شێوە ناوازەكان شی بكەنـەوەو لێـی بكۆڵنـەوە، كـە لـە چ بارودۆخێكدا ئەم دوعایە كراوە.

٤- دڵنیـابن كـە دوعـا، ئەگـەر بەڕاسـتی دوعـا بێـت بـێ شـك قبـوڵ دەبێـت، ئەگەرچی جار جارە شتێك ببینین كە لە ڕواڵەتدا ناكۆك و نارێك بێـت لەگـەڵ داواكراوەكـەی ئێمـەدا (ئەمـە جگـە لـەوەی كـە دوعـای ڕاسـتەقینە شەخسـیەت سـازو مـرۆڤ پـەروەرە). لـە جیـاتی توێژینـەوە تـەنیا دوو نمونـەتان بـۆ بـاس دەكەم:

یەكەم: منداڵێكی ٣ و٤ ساڵە كە ئێستا لاوێكە لە حەمـدی خـواوە تێگەیشـتوە خاوەن هەست (خوا تێگەیشتن و هەستی هەمومان زیاتر بكات) بۆ یەكـەم جـار پاسی دووقاتی بینی، كەوتە بیـانو گـرۆزی و وتـی مـن پاسـی دوو قـاتم دەوێـت، هەندێك یاری منداڵەیان بۆ كڕی، بەڵام تا ماوەیـەك هـەر ڕازی نـەدەبو چـونكە حـاڵی نـەدەبو ئـەوەی كڕیویانـە بـۆ ئـەو گونجـاوو لـەبارە، هـەروەها ڕۆح و ناوەڕۆكی داواكەی ئەویش هەر ئەوەیە، كە بۆیان كڕیوە پاسی دوو قات نەنیازە دەرونیەكانی ئەو تێر دەكات، نە سازگارە لەگەڵ تەمەن و تواناو جێگەو ڕێگەی ئەو.

دووەم: ئەگەر تەنیا – ظاهراً من الحیاة الدنیا- نەبینین و لە ئاخیرەت غافڵ نەبین وردبونەوە لەم دوو نمونەیە بەسە بۆ ڕۆشن بونەوەمان.

هەروەك لە كاتێـك بـە ئاشكرا ببیـنین دوژمـن دەیـەوێت بمانكوژێـت نابێـت نائومێد بین لە دوعای ڕزگاربون (ئاشكرایە قنوط لە بەرهەمەكانی كوفرە) بـۆ زیـاتر ڕونكردنـەوەی لایەنـەكانی ئـەم مەسـەلەیەو دڵخـۆش بـون ئومێـدەواری چەند بەشێك لە وەسیـەتی –بـاب العلـم- ی مـەزن علـی (ﷺ) بـۆ كـوڕە ئـازیزو خۆشەویستەكەی حسن بۆ نمونە باس دەكەین.

(ثم جعل في يدك مفاتيح خزائنه، بما اذن لك فيه من مسألته، فمتـى شـئت استفتحت بالدعاء ابواب نعمته، واسـتمطرت شـابيت رحمتـه،... نقبطفـك ابطـاء

اجافتـە، فـان العطيم علـى النيـة (وەك مەسـەلەى منداڵـە نەخۆشـەكە) وربمـا اخرت عنك لعطاء الامل، وربما سالت الشي فلا تؤتاه، واوتيـت خـيرأ منـه عـاجلا او اجلا او صرف عنك لما هو خير لك فلرب امر قد طلبته فيـه هـلاك دينـك لـو اوتيته، فلتكن مسالتك فيما يبقى لك جماله، وينفي عنك وبالـه، فالمـال لا يبقـى لك ولا تبقى له).

بۆ ئەوەى – على قدر النية – باشتر ڕونبێتـەوە مەسـەلەى چـەند قاضـى و خراپ بونى ئوتوبوسەكە بهێننەوە بيرى خۆتان.

١٠- يـەكێ لـە ڕەوشـت و تايبەتمەنـدى موسـڵمان ئەوەيـە، كـە چاوەڕوانى لـە خـەڵك كـەمتر بێـت بـۆ عەمـەل كـردن، بـەڵام لـەخۆى فـراوان و زۆرتـر بێـت و هەرچەند كارو چالاكى هەبێت بە كەمى بزانێت، يان بەشێوەيەكى تـر بيڵێين: بە بچوك دانانى خراپەى گەورەى خەڵك و بە گەورە دانـانى چاكەى بچوكيان، بە گەورە بينينى خراپەى بچوكى خۆى وبـە بچوك بينينـى چاكە گـەورەكانى خـۆى ڕەوشـتى موسـڵمانەتى خـۆى نيشـان دەدات (مەسـەلەى ئـەمرو نـەهى تەعاونى ئەحكامى تايبەتى خۆى هەيە).

مەسەلەى دووەم:

أ- پێشەكى بريتى يە لە فێربونى خوێنـدن و نوسين، فێربـونى قورئـان بـە پاراوى، فێربونى شەفاهى هەمو جۆرە ئـەركێكى فـەردى و ئيجتيمـاعى تـاكى و بە كۆمەڵ (بەماناى فراوانى خۆى).

عيبـاداتى تايبـەتى بـە تێگەيشـتنى مـەرج و ئـەركان و موسـتەحەبات و موبطلات فێر ببين.

سازكردنى نيەت دەبێت بناغەى كارى هەر كەس بێت ئـەم كەسـە، كـە تـازە فێـرى خوێنــدەوارى بـوە لـەو دەرسـانەى، كـە باسـى عيبـادەت و ئەركـە كۆمەڵايەتيەكانى تێدا دەكرێت، (حا چ فـەردى بێـت، يـان دەربـارەى ئەنـدامانى خێزان، يان تەنانەت خەڵك بە گشتى) ياداشت تەنيا بۆخۆى بنوسێتەوە.

ب: دەرسی گشتی، کەسێك، کە دەورەی ئەلفی بەسەرکەوتویی چ لە ڕوی زانستی و چ لە ڕوی کردەوە تەواو کرد لە کاتێکدا ئەگەر هەل و مەرج لەبار بێت بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکدا چەند سەعاتێك خوێندنەوەو وانەو دەورەی هەبێت دەتوانێت دەورەی گشتی دەست پێبکات.

لەم دەورەیەدا ئەوەی لە پێشتر تێگەیشتوە لەوانەی سادەدا بەشێوەیەکی عەمەلی دەبێت فێری ببێت دەرسەکان بریتین لە تەجوید لەسەر شێوەیەکی ناسراو + ڕەوشت بەلاّم بەشێوەیەکی سادەتر لە کتێبی –علم الاخلاق- بەلاّم بەحاڵی بون لە ڕۆحی ڕەوشت + فقە لە سنوری عیباداتی تایبەتی دا (وەك نوێژو ڕۆژوو)، ئەگەر کرا لەبوارەکانی تریشدا بکرێت.

لەم دەورەیەدا لەسەر شێوەی ئیسلامی – کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیته – دەبێت زۆر شێلگیرانەتر لە دەوری یەکەم چاودێری لە حاڵ و باری ئەو کەسە بکرێت.

ج- دەورەی فەقێ یەتی (قوتابخانە غەیرە ڕەسمیەکان) دەربارەی مەسەلە فراوانەکانی ئەم دەورەیە ئاماژەی ئەم دوو خاڵە دەکەم:

١) بە پێچەوانەی ڕابردووەوە –علوم الی و غایی – بەپێی بایەخی ڕاستەقینەی خۆی دەبێت بناسرێت وهەمو کاتێك بەهەرمەندی دەرونی – قلبی- (نەك زەینی ڕوت) بەردەوام لە کتاب و سونەت وەربگرێت.

٢) زانستی ڕەوشت هاوشان لەگەڵ ڕۆحی عیرفاندا دەبێت فێرببین و دڵ بە باسەکانیان ئاشنا بێت، هەڵبەتە بە ڕەچاوکردنی ئەو شتانەی لە باسی پەروەردەدا باسمان کرد (زۆر باسی تر لەم بارەیەوە کە لەچاویدا ئەمەی باسمان کردوە کەمە ).

لە کۆتایی دا سەرنجی ئەم دوو تێبینی یە بدەن:

یەکەم: هەروەك چەندین جار باس کراوە ئەگەر نەبنە خاوەن زانست و مەعاریفە ئیسلامیەکان هەمیشە هەر بە مقلد ی دەمێننەوە وە توانای ناسینی

صحیح و سەقیمتان نابێت هەرچیەکتان دەرخوارد بدەن، ئەگەر ژەهرێکی کوشندەش بێت، لەوانەیە تەنیا بەناوی تریاك نۆشی بکەن.

وریا بن وردبنەوە، ئەگەر ئێوە تواناو برستێکی زانستی کامل و باشتان هەبوایە من ئەوەندە بەتەنیا نەدەمامەوە و لە تێگەیشتنی شتە بنەڕەتیەکان یارمەتیتان دەدام ( ئاشکرایە، کە ناکۆکی کردن، ئەگەر بنیات نەر بێت لەسەر ڕایەك، کە پشتیوانی زانستی و عەقلی نەبێت، یان پشتیوانی نەقلی نەبێت بێ بایەخەو تەنانەت لەوانەیە بەهۆی تێکەڵ بونی –هوی- وە (بەمانای گشتی) ببێتە تاوان).

یەکێك لە بەرئەنجامە خەتەرناکەکانی بە موقەلدی مانەوەی ئێوە سەرهەڵدانی ئافەت و دەردی – دەستەگەری و مذهب سازی یە، کە لە باس و شیکردنەوەکانی نامیلکەی یەکەمی –دین و مرۆڤ- دا بە تێرو تەسەلی باسمان لێوە کردوە، ئازیزەکانم ئەوەی من دەیڵێم: دوو بەشە:

١- چەند مەسەلەیەکە لە –مسلمات – ی دین (جگە لە مەسەلە دیارە ناسراوەکانی وەکو فقە و کلام) کاری من بە بڕواو بۆچونی خۆم دەربارەی بارودۆخی کۆمەڵی ئەمڕۆ و حاڵەتی ئێوە ئیجتیهاد بکەم دیاری بکەم، کە پێویستی بەم شتەیە، یان بەم شێوەیە و سبەینێ بە شێوەیەکی ترە و هەڵوێست وێڕای زەحمەت و هەوڵی زانایانی تر، نیگەرانی من لەبارەی بەشی یەکەم دا ئەمەیە، کە ئەوەی بە بۆچونی من لەگەڵ ئەمڕۆدا دەگونجێت ئێوە سبەینێ دوای مردنی من وشك و تەقلیدیانە پێوەی بنوسێن.

بەڵام لەبارەی بەشی دووەمەوە، سەرباری ئەم کارەی کە دەیکەن نیگەرانی فراوانی من لەوەدایە، کە ئەم بڕواو بۆچونانەی من وەك کتاب و سوننەت حیسابی بۆ بکەن و پێچەوانەی ئەوانە بە باطل بزانن، هەرچەند لە ڕاستیدا ئەم بۆچونانەی من لەهی کەخەڵکی تر دروست تر بن، ئەگەر بەشێوەیەکی دەمارگیرانەی ئاواو بەم شێوەیە تەقلیدی یە بۆچونەکانی من لە بۆچونی یەك مرۆڤ بان تر حساب بکەن و لە ڕیزی کتاب و سوننەت حسابی بکەن و بە –

حجتی مطلقی- بزانن ئیتر بتانەوێت و نەتانەوێت وردە وردە دوچاری شرك و فرقە گەری و مذهب سازی دەبن، لە کاتێکدا نزیکەی ٢٠ ساڵە (کاتی نوسینی نامەکە لە هەشتاکاندا) ئارەزو کۆششم ئەوەیە، کە دەمارگیری مەذهەبی لەناوبچێت و بێگانەیی موسڵمانان دووبارە بگۆڕێتەوە بە برایەتی (بەڵام نەك بە پەیڕەوی لەم، یان لەو مەذهەبە، کە –حجت نسبین- و تەنیا ڕێگایەکی عەمەلین بۆ موسڵمانان لەم سەردەمەدا)دەترسم سەرەنجامی کارەکەم بەهۆی پەیڕەوی تەقلیدیانەی ئێوە وای لێ بێت، کە دیسان دەردێکی تر بکەمە سەرباری دەردەکانی تری ئەم ئوممەتە لێك هەڵوەشاوەو کۆمەڵێکی تر لە پەیکەری دەست لێ وەشاوی جودا بێتەوە (ورد بنەوە لە باسی ئەنجامەکانی دەستەگەری ) هەروەها ئەم هەمو باسە دووبارەو چەند بارە کراوانە لەم بارەیەوە لەبەر ئەوەیە، کە یەکەم فەسادێکی ئاوا بەدی نەیەت و ئەگەر –خوانەکردە- کەسانێك بەدیان هێنا بە حوکم – سنکتب ما قدموا واثارهم- لەسەر حسابی من نەنوسرێت.

ڕۆڵەکانم براکانم خوشکەکانم !

ئەگەر سەرئەنجامی کارو هەوڵی پێشینانی ئێمە، چ بە هەڵەو چ بە عمدی وای لێهاتوە، کە ئێمە بەش بەش بین، نە ئێمەو نە چەندین پشتی ڕابردو (کە خۆیان لەم بەش بەش بون و ناکۆکی و مەذهەب بازیەدا دەستیان نەبوە) تاوان بار نین بەمەرجێك کە دوو ئەرك ئەنجام بدەین:

١- هەوڵ و کۆششێکی بەردەوام و سەرتاپاگیرو صادقیانە بەپێی شێوازی ئیسلامی بدەن، بۆ لەنێو بردنی بێگانەیی و دوری یەك، کە هەیە.

٢- کۆشش بۆ فەراهەم بونی بارودۆخێك، کە زانایانی هەمو مەزهەب و فیرقە جیاوازەکان بەو پەڕی بێ گەردی و شەوقی ئیمانەوە بۆ توێژینەوە لەبارەی یەك یەکی مەسەلەکان تا ئومەتی ئیسلامی و دین زیندوبێتەوە، کەمتەرخەمی لەم دوو ئەرکەدا (کە شێوەو چەشنی دابین کردنی (اجراء)

جۆراوجۆری هەیە) یاخی بون و بێ گوێ ڕایەڵی یە لە بەرامبەر دەقی ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾ (سورة الحجرات: الآية ١٠) هاوار لە ئێمە ئەگەر لەگەڵ هەمو تاقیکردنەوەكانی سەدەكانی ڕابردودا دیسان لە جیاتی (اصلاح بین اخوین) تۆوی ناكۆكیەكی نوێ لە نێوان ئومەتدا بڵاو بكەینەوە.

ئومێدەوارم تێبینی و ئاماژەكانی ئێستاو ڕابردو بۆ هەست كردن بە لێپرسراوی لە بەرامبەر ئەركەكانمان و دورخستنەوە لە گوناه بەس بێت – وعلى الله قصد السبيل ومنه الهداية- ئەركەكانمان لە بەرامبەر خەڵكدا موسڵمانان بە گشتی بەپێی پایەو دەقی ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ و (لا يؤمن احدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) ئەركی سەرشانمان تەواوی ئەوەی بۆخۆمان پێمان خۆشە بۆ هەمو موسڵمانان بە گشتی پێمان خۆش بێت، بەڵام بەپێی ڕادەو ڕێژەی تەكلیف لەبەر ئەوەی ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ (سورة البقرة: الآية ٢٨٦) سنورەكانی جێ بەجێ كردنی ئەم تەكلیفە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر دەگۆڕێت.

دروستكەری بونەوەرو سروشتی مرۆڤ و تەنانەت گیانداران و وێڕای جیاوازیەك تەنانەت هەمو دروستكراوەكانی وا دروستكردوە، كە -محبت- خۆشەویستی پێخۆشەو سازگارە لە گەڵیداو لە بێ سۆزی ونا خۆشەویستی ونا -محبت- بێزارە لەبەر ئەوەی دینی خوا هاوشان و سازگارە لەگەڵ فیطرەتی مرۆڤدا، نەك تەنیا جێبەجێكردنی لێپرسراوی و هاوكاری – ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونكەر- دەربارەی موسڵمانان، بەڵكو هەست بە لێپرسراوی ئەركی – انذار و تبشیر-دەربارەی غەیرە موسڵمان و تەنانەت دەربارەی موستەكبیرە كافرەكانیش پێویستە بە نەرمی و بە -محبت- خۆشەویستی و دڵسۆزی یەوە ئەنجام بدرێت- انا لكم ناصح وامین- بەڵام جار هەیە بەهۆی هەڵ و مەرجی تایبەتی یەوە، ئەم شێوە سەرەكی یە دەگۆڕێت.

لــە بــارەی جیــاوازی مەزهەبــەوە لــە نێوانــان موســڵمانانـدا جگــە لــەو جەدوەلانەی – لە کتێبی دەربارەی کوردستاندا - هەیە جەدوەلی تریش هەیە کە جار جار لەبارەیانەوە قسەمان کردوە و بە کورتی ئەمەیە: دەبێت زۆرتر باسی ئەو مەسەلانە بکرێت کە مایەی نزیکی یەو هاوبەشە و لەو باسانە دوربکەوینەوە کە مایەی دووریمانەو جێی ناکۆکی یە ( مەگەر لەبارودۆخی ڕەوای خۆیدا ئەیش بە سێ مەرج:

١- بونی زانستی تەواو.

٢- نیەتی سالم.

٣- بۆ چارەسەر بێت.

هەرکاتێك، کە ببێتە مایەی ساردبونەوەی پەیوەندی و سۆزی برایانە لە نێوانی دوو دەستەی ئیسلامی داو ببێتە مایەی قۆزتنەوەی بەدخوازان و دوژمنان بۆ زیاتر کردنی ناکۆکی و دوژمنایەتی، پێویستە زۆر جدی و شێلگیرانە لێی دوربکەوینەوە.

## ئەرکەکانمان لە بارەی غەیری موسڵمانەوە

دەربارەی بەنەماو پایەی ئەم مەسەلەیە زۆر جار باسمانکردوە ئەوەی ئێستا بە پێویستی دەزانم ئەم چەند تێبنی یە:

١- لەگەڵ – ائمة الكفر – بەهیچ جۆرێك نابێت پەیوەندیتان هەبێت، مەگەر کەسانێك بە توانای تەواو و کامڵ بۆ ئەنجامدانی کارێکی ئیصلاحی، ئەمەش پاش ئەوە دەبێت، لەگەڵ باقی کەسانی تری پسپۆڕو بەتوانادا ڕاوێژ بکات، ئەویش پەیوەدییەکی سنوردارو دیاری کراو لە پێناوی دین و شۆڕش و موسڵماناندا ئەنجام بدرێت و سودمەند بێت.

٢- لەکاتێکدا، ئەگەر پەیوەندی خێزانی هەبێت، بەپێی ئەوەی لە جەدوەلەکاندا کە پەیوەندی ئەخلاقی و عەقیدەتی دیاری دەکات، هەروەها ئەو

باسانەی كراوە ڕەفتار بكرێت، هەر كەسێك بەڕادەی توانای خۆی دەبێت باس و خواس بكات، ئەگەر لەكاتێكدا باسێكی زیاد لە توانای ئەو كەسە هاتە پێشەوە بەو پەڕی تەقواو سنگ فراوانی دەری ببڕێت، كە توانای ئەم باسەی نی یە، ئەمە بنەمایەكی گشتی یە و هەمیشەیی یە).

٣- هەر كەسێك، ئەگەر فرسەتێكی لەباری بۆ هاتە پێشەوە بەپێی توانای خۆی و ئەوان باسیان بۆ بكات، بەپێی بنەماكانی تەبلیغی ئیسلامی هەوڵ بدات و بۆ هیدایەتیان لەم كاتانەدا نابێت ئاماژە بۆ ئەو شتانە بكرێت، كە مایەی وروژاندن بێت، جا ئەو باسەی چ لە بارەی مەكتەبێكی فیكری بێت، یان لاری پەیڕەوانی ئەو مەكتەبە لە مێژودا، یان تاوانەكانی ئەو حزبە غەیرە ئیسلامی یانە بێت كە لە كوردستاندا كردیان، مەگەر بەو مەرجەی ئەو كەسە ئامادەیی بیستنی ئەو باسەی بەدەست هێنا بێت، لەم كاتەدا بەشێوەیەك، كە ڕاشەكاندن و زیندوكردنەوەی هەستە سالمەكان و مایەی ئازادبونی ڕۆح و ڕەوانی — ضمیر - مسۆگەر بكات، نەك بە توانج و تەشەرو توندو تیژی.

# تەزكیە و تەعلیم

بـۆ پـەروەردەكردنی یـەك تـۆو، دەبێـت تایبەتمەنـدی یـەكانی ئـەو تـۆوە بناسین، كە ئەو تۆوە لە چ كاتێكدا پەروەردە دەبێت؟

لە چ وەرزێكدا دەبێت بیچێنین، لـە چ جـۆرە خاكێكدا بەچاكی نـەش و نما دەكات؟

چەند ئاوی دەوێت، لە چ كاتێكدا دەبێت ئاوی لێ ببرێت؟

چ جۆرە پەینێك پێویستە بـۆی، چ جـۆرە تیشـكێكی خـۆر دەتوانێـت زیـانی پێبگەیەنێت، چ جۆرە دەرمانێك، یان چ ڕێگایـەك دەتوانێت لـەو تیشكە خـۆرە بیپارێزێت؟

دەبێت هەمو ئەمانە بزانین ئـەو كاتـە دڵنیـادەبین، كـە دەتـوانین ئـەم تـۆوە پەروەردە بكەین و بەشێوەیەكی ڕێك و پێك و تەواو بەرهەمی بهێنین و سودی لێ وەربگرین.

ئێمـە دەمانـەوێت ژیـانی مـرۆڤ لەسـەر ڕوی زەوی ژیـانێكی بـاش بێـت، تواناكـانی نەفـەوتێن و هـەمو ئـەو نیعمەتانـەی لەبەردەسـتی دایـە بەهـەدەری نەدات و بەپێچەوانەوە زۆر باش بەكاریان بهێنێت و سودیان لێ وەربگرێت. بـۆ بەدەست هێنانی ئەم ئاواتـە دەبێـت چـی بكـەین؟ تـەنیا بەشـێوەیەك دەتـوانین ڕێگای باش خستنە گەڕی هەمو تواناو بڕستەكانی مرۆڤ و هـەمو ئـەو شـتانەی لەبەر دەستی دان بدۆزینەوە، كە مـرۆڤ و بـارودۆخی ژیـانی و هـەل و مـەرجی گەشەو پێداویسـتیەكانی كامـڵ بـونی بناسـین هـەروەك لـەو نمونـەیـە سـادەیەدا وتمان: ئەو مەسەلەیە ڕون بۆوە، كـە ناسـینی یـەك تـۆو پەیوەنـدی یـەكانی بـۆ پـەروەردەكردن، كارێكـە لـە توانـای مـرۆڤ دایـەوە دەتوانرێـت دوای ناسـینی

تایبەتمەندی یەكانی شێوازو بەرنامەی تایبەتی پەروەردەكردنی بۆ دابنرێت، ئایە ئەم كارە دەربارەی مرۆڤ دەكرێت؟

ئەم كارە دەربارەی مرۆڤ لە توانادا نی یەو ناتوانرێت بەو رێك و پێكی یەو بەو كاملی یە مرۆڤ بناسرێت و بەرنامەیەكی هەمەلایەنەو فراوان كە پێویستی پەروەردە كردنێتی دابنرێت.

لێرەدا بەرنامە دانەر هەمان ئەو مرۆڤەیە، كە بەرنامەی بۆ دادەنێت ئێمە هەر چەند پێشكەوتوتر دەبین زانین و بازنەی دەسەلات و هەلس و كەوتمان فراوان تر دەبێت، بەهەمان ئەندازە ژیانمان ئالۆزترو دەرون و رۆح و رەوانمان ئالۆزتر دەبێت، لەبەر ئەمە بەرنامەدانان بۆ پەروەردەكردنی ئێمە (مرۆڤ) قورستر دەبێت.

ئەوەی بۆناسینی یەك تۆو لەباردایەو دەكرێت بۆ ناسینی مرۆڤ هەرگیز لەبارنیە و ناكرێت و دانانی بەرنامەیەكی هەمو لایەنە بە شێوەیەك، كە مرۆڤ بە چاكی پەروەردە بێت و لە خۆی و تواناكانی باش سود وەربگرێت و ئەو نیعمەتانەی خراوەتە بەردەستی باش بیانخاتە گەڕ، تەنیا لە تواناو باری كەسێكدایە، كە بەشێوەیەكی هەمو لایەنەو كامڵ مرۆڤ دەناسێت و پەیوەندی یەكانی لەگەڵ دەورو پشتی دا دەرك دەكات.

ئایە بۆ پەروەردە كردنی ئەو تۆوەی بە نمونە هێنامانەوە دەكرێت، ئەو تۆوە خۆی بەرنامە دابنێت یان لەتۆوەكە كامڵ تر؟

بۆ نمونە: ئایە دەكرێت گیاندارێك یان شتێك كە لە گیاندار بچێت بەرنامە بۆ خۆی دابنێت؟

ئاشكرایە كە نەخێر.

مرۆڤ هەروەك ئەو تۆوەیە، كە بۆ پەروەردەكردنی بەرنامەیەكی پێویستە، مرۆڤ خۆی ناتوانێت ئەو كارە بكات، بەهەمان شێوە، كە ئەو تۆوە ناتوانێت بەرنامە بۆ خۆی دابنێت، كەسێك، كە بەرنامە بۆ شتێك دادەنێت پێویستە

هەمو ڕازو نهێنی و تایبەتمەندی یەکانی ئەو شتە بەتەواوی بناسێت، بەدەست هێنانی ئەم ناسینە بۆ مرۆڤ هەرگیز ناکرێت.

بەڵگەیەکی زۆر سادەو ئاشکرا دەخەینە بەرچاو دەرون ناسێك کە چەندین ساڵ توێژینـەوە لەسـەر ڕەوان و دەرونـی یـەك کـەس دەکات بـەم ئەندازەیـەش دیسان ناتوانێت بەتەواوی ئەو کەسە بناسێت، تەنیا ڕەوانی نا هۆشیاری دەڵێم: (بـاطن) نـەك هـەمو ڕەوانـی بەهـەمو توانـاو بڕسـت و نیـازو ئاواتـە تـاکی و کۆمەڵایەتییـەکانی یـەوە تـەنیا یـەك کـەس، نـەك سـەد کـەس و هـەزار کـەس، نەخێر تەنیا یەك کەس ناتوانێت بناسێت.

ئەمـە بەڵگەیـەکی زۆر سـادەو ئاشـکرایە کـە مـرۆڤ ناتوانێـت بەرنامـە بـۆ پـەروەردەکردنی مـرۆڤ دابنێـت بـۆ ئـەوەی بـە باشـترین شـێوە ئـەو تـۆوە بەکاربهێنرێت، لەبارەی مرۆڤیش بەهەمان شێوە بێت.

کەسێك، کە توانـاو تایبەتمەنـدی یـەکانی مـرۆڤ و بـارودۆخی ژیـانی بـاش دەناسێت و دەزانێت چ شتێك خراوەتـە بـەر دەستی و چ هـەڵ و مـەرجێکی بـۆ سازکراوە دەتوانێت بەرنامە بۆ مرۆڤ دابنێت لەهەمو تواناکانی بەباشی سود وەربگرێت.

نەك بـەو شێوەیە هەڵەیـەی ئـەمڕۆ، کـە توانـای مـرۆڤ دەخرێتـە گـەڕ بـەو شێوەیە، کە تا کارێکی باش دەکات، دەیان کاری خراپ و نابەجێ دەکات، لەبـەر ئەمە بەهیچ جۆرێك ناکرێت و نابێت مرۆڤ بەرنامەی ژیانی خـۆی دابڕێـژێت. هەرگیز ناکرێـت مـرۆڤ خـۆی، تـا ئـەم سنورە کامڵە هۆشـیارو زانابێـت، کاتێـك بەرنامەیەك، کە شایستەی ژیان و کەسایەتی مرۆڤ بێت و بخرێتە بەردەستی و جێ بەجێ کردنی ئەو بەرنامەیە بەخۆی بسپێرێت، چونکە مەخلوقێکی ژیـرو هۆشیارە دەتوانێت بەچاکی جێبەجێی بکات.

بەرنامە دانان و جێبەجێکردنی بەرنامە دوو شتی جیاوازە.

زانین و هۆشیاریەك کە بۆ جـێ بـەجێ کـردن پێویستە هـیچ کاتێـك بەشـی بەرنامە دانان ناکات و بەس نی یە بۆی، کاتێك بەرنامە دانرا دەسپێردرێت بـە

مرۆڤ تا دابینی بکات.مرۆڤ دەتوانێت بە ناسین و زانینی شتە پێویستەکان ئـەم بەرنامە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دابین بکات.

ئەمما چ کاتێك دەتوانرێت لەو بەرنامەیـە ئامـانج و سـەرئەنجامێکی مـاقوڵ بەدەست بهێنرێت؟

کاتێك ئەو مەرجانەی بەرنامە دانەر دای ناوە ڕەچاوبکرێت.

لـە کـۆڕی ڕابـردوودا وتم ئەگـەر فێرکـردن هـەبێت بـەڵام پـەروەردە کـردن نەبێت کۆمەڵ توشی چەندین نەخۆشی دەبێت کە چـەند نمونەیـەکمان خسـتە بەر چاو، نمونەی سادەی ئەمەیە کە مرۆڤ لە ڕوی قسەوە دەبنە نمونە بەڵام لە ڕوی —ڕەوشت و-کردەوە — هیچ و پوچ و پیس.

ڕێگایــەکی بــاش بــۆ ئــەوەی مــرۆڤ وای بەســەر نەیــەت ئەمەیــە، کــە: پەروەردەکردن دەکەوێتە پێش فێرکردنەوە بەڵام ئەم پێش و دواکەوتنە بـە چ مانا؟

مانای ئەم قسەیە ئەمە نی یە کە پەروەردە کـردن بـەبێ ناسین و زانسـت مەیســەر دەبێــت، نــەخێر پــەروەردە کــردن لــە ڕوی دابینکــردن و کــردارەوە هەمیشـە دوای فێرکردنـە بـەڵام لـەو شـتانەی وا فێـری مـرۆڤ دەکرێـت چـەند بنەمایەکی سەرەکی هەیە کە دەبێت لەسەرەتادا ئەوانە فێر بکرێت و مرۆڤ پێ بەپێی ئەو ناسینە پەیدای کردوە پەروەردەبکرێت و گەشە بکات.

پاش فێربونی بنەماو مەسەلە سەرەکی یەکان پەروەردە بونی گونجاو وێڕای ئەو فێرکردنی تر دەخرێتە بەردەستی، واتە پاش پـەروەردەکردن و فێرکـردن کامـڵ دەکرێـت و تـەنیا بـەم شێوەیە، کـە ئـەو زانـین و فێرکردنـە سـودی پـێ دەگەیـەنێت و زیـانی نابێـت بـۆی، کەواتـە کاتێـك دەڵـێین: (فێرکـردن لـەدوای پەروەردەکردن) بە دوو مانایە:

١- بایەخی فێرکـردن بـە نیسـبەت بایـەخی پـەروەردەکردن سـانەویەو لـق و بەشێکە، واتە، ئەگەر خوێندەواری و زانست هـەبێت، بـەڵام پـەروەردەی ڕێـك و

پێك نـەبێت ئـەو خوێنـدەواری و زانسـتە لەوانەیـە هـیچ سـودێك نەگەیـەنێت، تەنانەت زیان بەخشیش بێت بۆی.

٢- فێرکردن کۆمەڵەیـەکی زۆر گـەورەو بـێ پایانـە، ئـەو کۆمەڵـە بـێ پایانـە رادەیـەکی زۆر کـەمی — لەوانەیەلـە ١٪ ی — بکەوێتـە پـێش پەروەردەکردنـەوە ئـەو رێـژە کەمـەش بریتیـە لـە ناسـینی مەسـەلە گشـتی و سـەرەکی یـەکانی بونەوەر، کە مـرۆڤ فێـر دەکرێـت و شـارەزا دەکرێـت لێـی، هاورێـك لەگـەڵ ئـەو زانینەدا دەبێت پـەروەردە بکرێـت، بـاقی ٩٩٪ کـەی تـری فێرکـردن دوا بـەدوای پـەروەردەکردن بـەم دوو ئیعتیبـارە لـە سـەرجەم دا پـەروەردە لـە پـێش فێرکردندایە.

ئێسـتا ئـەم باسـە گـران و درێـژەی دەرسـی رابـردوو بـەم شـێوەیە کـورت دەکەمـەوە کـە جیـاوازی —دیـن- ئـەرکێك کـە پێغەمبـەران — علـیهم السـلام - هەیانە لەگەڵ بەرنامـەکانی مرۆڤـدا لـە بنـەرەت و مەسـەلە سـەرەکیەکاندا کـە قورئـان لەچـەند ئایەتێکـدا فێرمـان دەکـات دەردەکـەوێت ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ (سـورة البقـرة: الآيـة ١٥١) پاشـان ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ (سورة البقرة: الآية ١٥١) بەشـێوەیەکی کـورت ئـەرکی سەرشانی پێغەمبەری پێشەوا محمد ﷺ ئەمەیە، کە سەرەتا هەمو خەڵك بەرەو حەق و حەقیقەت و ژیانی چاك و شتە بایەخ دارەکانی ژیان دەعـوەت دەکات و بانگیان دەکات بۆ رزگاری لە سەرگەردانی و بایەخ دان بە چاك و راسـتی ژیـان، هاوشان لەگەڵ جیاوازی جۆراوجۆری ئەو کەسانەی کە بیرو ژیانیـان وەك یـەك نی یە، هەنـدێك زۆر زو دوای دەکـەون و ئامـادەن تـا حـەق قبـوڵ بکـەن. دیـارە ئەمانـە زۆر تـر بـەرەو بانگەکـەی ئـەو دێـن، کەسـانێکی تـریش بـەپێی رێـژەو رادەی جیاوازی خۆیان بە دوایاندا دێن، بۆ کەسانێك کە حـەقیان قبـوڵ کـردوە زۆر زو مەسـەلەی زیـادکردنی زانینـەکان نابێتـە مەسـەلەیەکی گـرنگ بۆیـان،

بـەڵکو بنـەما سـەرەتاییەکانیان فێردەکرێـت و پاشـان بـەپێی ئـەو فێرکردنـە پەروەردە دەکرێن.

پـاش ئـەم قۆناغەیـە کـە نـۆرەی فێرکردنـی بـاقی زانینـەکان دێـت، ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ چ دەربـارەی دیاردەکـانی بونـەوەر (هـەم مرۆڤ و هەم باقی دنیا)، چ دەربـارەی ڕاست و دروسـتی ژیـانی مـرۆڤ وە پاشـان فێربونی ئەو شتانەی کە پێویستە، بـەڵام هـیچ کاتێـك مـرۆڤ بـەبێ ڕێنمایی پێغەمبـەران – علیهم السلام- ناتوانێـت ئەو شـتانە بزانێـت، ئەگـەر بـەوردی سەیرێکی مێژوی زانست بکەین و شی بکەینەوە ئەو مەسـەلەیە زۆر ئاشـکرایە، کـە زانایـانی هـەر سـەردەمێك کاتێـك هۆشـیان خسـتۆتە گـەڕ (بگـوزەرێن لـە هیدایەتـە الهـی یـەکان) دەسـتیان کـردوە بـە چـالاکی لـە زەمینـەی زانسـتیدا سەرەکی ترین مەسەلە، کە بۆیان پێش هاتوە ئەمە بوە، کە:

بونەوەر چییە؟

مرۆڤ چییە؟

ئەمانـە سـەرەتایی تـرین مەسـەلەکن، کـە لەیەکـەم قۆنـاغی جوڵانەوەیـەکی فکریدا هاتونەتە گۆڕێ، پاشـان وردە وردە ئەمانـە بونەتـە بناغـەی پەیـدابونی بیرە فەلسەفی یەکان، واتـە توێژینـەوەو چالاکی بـیری بـۆ پەیـداکردنی وەڵامـی ئەم دوو پرسیارە.

دوای ئەم دوو شتە سـەرەکی یـە کەوتونەتـە تـاوتوێکردنی مەسـەلەکانی تـر بەهەمان شێوەی ڕابردو، واتە بەو پەڕی گـەورەیی و نـرخ دانـان بـۆ زانستەکان (زۆر بەکورتی ئەم مەسەلەیە بەیان بکەم).

پاشـان قۆنـاغی جیـاواز ڕابـردوە بەسـەر ئـەم هەواڵانـەداو چـالاکی هۆشـی مرۆڤـەکان لـەبارەی بونـەوەر و مرۆڤـەوە لەسـەرەتای بونـەوەر تـا ئێسـتا گەیشتونەتە زۆر مەسەلەی وردو فەرعی و لق و پۆپ.

ئــەم باســە ســەرەكی و وردانــە (اصلی و فرعــی) دەســت بەدەســت هــاتوە تــا سەرئەنجام سێ لقی لێ جودابۆتەوە:

١- الهیات: یــان فەلسەفەی اعلی، كــە دەربــارەی ئەسـڵی بــون دەدوێت وئــەم زانستە هەمیشە لە پلەی یەكەم دایە.

٢- طبیعیات: دەربارەی هەمو ئەو شتانەی لە ئاسمان و زەوی و لە بونەوەردا هەن دەدوێت، كە چین و چۆنن.

٣- ریاضیات: دەربــارەی نیسـبەتی دیاردەكـانی بــون و شـێوەكانی و ژمارەكـان دەدوێت و پەیوەندیان لەگەڵ یەكدا.

سەرجەم فەلسەفە بریتی بوە لەم سێ لقە سـەرەكییە، پاشـان بـەو شـێوەیە، كە دەزانین چالاكی بیری هەر بەردەوام بوەو لەم زانسـتانە لـق و پـۆپی تـری لێ جیابۆتەوە.

بەبەردەوامی هەر ڕۆژێك لەهەر زانستێك لقێكی تـازە جیادەبێتـەوە، پاشـان ئەو لقە دەبێتە زانستێكی سـەربەخۆ بـەم شـێوەیە هـەر دەڕوات و بـە ژمـارەی زانستەكان زیاد دەبێت.

ئــەم كورتەیــە پێوانەیــەكی ســادەو دروســتە لەدەســت ئێمــەدا تــا بــزانین زانستەكان چۆن دەستیان پێكردوەو چ قۆناغ و گۆڕانكاریەكیان بەسەردا هـاتوە، تا گەیشتۆتە ئێستا.

ئەگــەر بمانــەوێت لــە ڕوی بنەمایــەكی دروســتەوە لەهــەر مەســەلەیەك بكۆڵینەوە، ئەگەر ببینین كۆمەڵێك مەسەلەی جیـاواز هەیـە، كـە لەلایەنێكـەوە بەیەكەوە پەیوەستن، ئـەوەی بـۆ ئێمـە گرنگـە ئەوەیـە، كـە ڕوی یـەكبونی ئـەو مەسـەلانە واتــە: ڕیشـەو بناغەكـەیان بـزانین، پاشـان بكەوینــە نوێكردنـەوەی مەسەلە فەرعی یەكان ئەمە هەوەڵین شتە لەهەر زانستێكدا.

بۆ نمونە دەربارەی زانستی – نحو- گرنـگ ئەوەیـە بـزانین –كلام- چـی یـەو تركیباتی –كلمات- لەگەڵ یەكتریدا چۆنن.

لـە زانسـتی —صـرفدا- گـرنگ ئەوەیـە بـزانین —کلمـة- چـییەو گۆڕانکـاری یەکانی، کە بەسەری دادێت چۆنە.

لـە ماتماتیکـدا گـرنگترین شـت زانینـی —عـدد- ژمارەکانـەو کـەم و زیـادی ژمارەکـان چـۆنەو تایبەتمەنـدی یـەکانی ژمارەکـان چـی یەوئـەو کـارە سـەرەکی یانەی بە —اعداد- ئەنجام دەدرێت کامانەیە.

لەهـەر زانسـتێکدا تـا بنـەمای سـەرەکی واتـە: ئەوسـیفات و ئەحواڵـەی، کـە لەگشت مەسەلەیەکدا هەیەو پێـی دەوترێـت — موضـوع - نـەزانرێت هـەوڵ دان بۆ زانینی مەسەلە فەرعییەکان پوچ و بێ هودەیە.

لە ڕوی توێژینەوەو نەش و نمـای مێـژویی زانسـتەکانەوە، حـاڵی دەبـین، کـە مەسەلەی سەرەکی زانستەکان چی بوە؟

مسەلەی سەرەکی گشت زانستەکان ئەمە بوە کە بونەوەر چی یەو مرۆڤ چی یە؟

ئەمانە سەرەتایی ترین مەسەلەیەکن، کە مرۆڤ دەربارەیان بیری کردۆتەوەو ئالێرەوە، کە بونەوەر چیە، مرۆڤ چیە؟

وردە وردە جوڵانـەوەی هۆشـی و بـیری —فکـری- دەسـتی پێکـردو ئـەم لـق و فەرعانەی بەدی هاتن:

ئێسـتاش بـۆ ئـەوەی هـەوڵ و تەقـەلای ئێمـە لەسـەر بناغـە مـەبنا بێـت و کۆششێکی زانستی و مـەنتقی بێـت و کارکردنمـان لەگـەڵ زانسـتە جیاوازەکانـدا دروست بێت و دڵنیابین، کە لەو زانستانە (کە هەریەکیان وەك مەسـەلەیەکن و فەرعێکن بۆ مەسەلە سەرەکی یەکە) لەگەڵ ڕیشەو مەوزوعەکانیاندا بەرقـەرار بـن و ڕازی ئـەو مەسـەلە سـەرەکی یـەمان پەیـدا کردبێـت، واتـە: بەشـێوەیەکی سەرەکی و بنەمایی بزانین، کـە بونـەوەر چـی یـەو مـرۆڤ چیە؟ لەبـەر ئـەوەی بونەوەرو مرۆڤ ڕیشەو مەوزوعی سەرەکی هەمو زانستەکانن ئاشـکرایە، ئەگـەر کەسێك نەزانێت عدد چیە هەرچـی هـەوڵ بـدات بـۆ ئـەوەی ریاضیات تێبگـات

هەرکارێکی بێ هودەو پوچ ئەنجام دەدات، ناتوانێت لەو هەمو هەوڵ و ماندو بونەی سود وەربگرێت.

مەسەلەی سەرەکی هەمو زانستەکان خودی مرۆڤ وبونە، بون وەك ئەو کۆمەڵەیەی، کە مرۆڤ کاری تێدا دەکات، مرۆڤیش خۆی وەك مەوزوع و ئەسڵێك کە خەریکی کارکردنەو دەیەوێت لە بونەوەر سود وەربگرێت بۆ خۆی.

ئێمە تا کاتێك، کە بەشێوەیەکی گشتی و سەرەکی مرۆڤ و بون نەناسین هەوڵمان بۆ ئەوەی لە وجودی خۆمان و بەهرەکانی بونەوەر سودی باشتر وەربگرین، هەروەکو هەوڵی ئەو کەسە وایە، کە ژمارەکان ناناسێت و خەریکی فێربونی ریاضیاتە، ئەم کەسە چۆن لە زەحمەتی خۆی سود وەرناگرێت، ئێمەش لە ڕەنجی خۆمان ناتوانین سودی باش وەربگرین، ئەمە بنەمایەکی زۆر سادەو ساکارو ڕۆشنە.

بەم دەلیلەیە کە لە – دین -دا بنەما بریتیە لەو مەسەلە سەرەکیانەی، کە هەمو زانستەکان پشتی پێ دەبەستن هەمو زانستەکان لق و پۆپی ئەم مەسەلە سەرەتایی و بنەڕەتییەن، کە لە –دین-دا پێش هەر شتێك فێری مرۆڤ دەکرێت.

کاتێك دەتەوێت کەسێك فێری ماتماتیك بکەیت سەرەتا ژمارەکانی فێر دەکەیت، ئەگەر بەم شێوەیە نەکەیت توانای ئەم کەسە لەناو دەبەیت و سەرپێیی فێری دەکەیت، دین هەم لەسەرەتاوە سەرەتایی ترین و ئەساسی ترین مەسەلە بۆ هەمو بونەوەرو هەمو زانستەکان فێری مرۆڤ دەکات نەك سەرپێی پەروەردەمان بکات و زانستە جۆراوجۆرەکانمان فێر بکات.

بەکورتی ناسینی فراوانی شتە فەرعی یەکانمان پێبدات لە کاتێکدا، کە مەسەلە سەرەکیەکانی بونەوەر، کە هەمو زانستەکان پشتی پێ دەبەستن – نەزانین.

ئێستاو هەرکاتێك بتەوێت مێژوی هەر زانستێك بزانیت و بگەڕێیتەوە بۆ دواوە، بەهەمان مەسەلەی سەرەکی دەگەیت.

بۆ نمونە میكرۆب ناسی لەسەر بناغەیەك دامەزراوە:

لە كوێوە هاتوە؟

ڕابردوی تـاو تـوێ بكـە دیسان بـە زانستە سـەرەكیەكە دەگـەیت، قۆنـاغ بـە قۆناغ ڕیشەیی تر و سنوردار تـر دەبێت، تـا سـەرئەنجام دەگاتـە ئـەو سێ لقـە سەرەكی یەو، پاشان بە دوو پرسیاری سەرەكی، كە بونەوەر چی یە؟

مرۆڤ چی یە؟

كەواتە ئەو دوو زانستە مەسەلەی سەرەكی تەواوی زانستەكانن.

كاتێك تەقەلای جۆراجۆری ئێمـە ئـەنجامی دەبێت و سـودمەند دەبێت، كـە سەرەتا مەسـەلە سـەرەكی یـەكان فێـر بـین واتـە: ڕازو نهێنـی وجودی مـرۆڤ و بونـەوەر.

شێوازی دیـن، كـە قورئـان بـەیانی دەكـات بـەم شێوەیە ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ﴾ (سورة البقرة: الآية ١٥١) تەزكیە یەعنی چی؟

واتـە: دامەزرانـدنی شەخسـیەتی مـرۆڤ، دەرونـی مـرۆڤ، دابـین كردنـی كەسایەتی مـرۆڤ لـە ڕێگـای ناسـینە سـەرەكی و ژێرخانییەكانـەوە، پـاش ئەمـە دەتوانێت هەر زانستێك فێـر بكرێت، بـەو شێوەیەی كەسێك، ئەگـەر بیـەوێت ماتماتیـك فێـر بێـت، دەبێت سـەرەتا ژمارەكـان فێـر بێت، پـاش ئەمانـە هـەوڵ دەدات بنەماو یاساكانی تر فێربێت، مرۆڤ دەبێت بنەماو مەسـەلە سـەرەكیەكان بـە دروسـتی فێـر بێـت، بـە شێوەیەك، كـە شەخسیەتی مەعنـەوی ئـەو كەسـە لەگەڵ تێگەیشتنی دا هاوشێوە بێت.

پاش ئەم سەرەتایە هەر چی یەك فێردەبێت بەسودەو لەهـەمو زانستەكان بـە ڕێك وپێكی سـود وەردەگرێت بـە شێوەیەك، كـە هیچ كاتێك ئامـادە نیـە بۆمبی ئەتۆمی دروستبكات بۆ نابوتكردنی مرۆڤ، بۆمبی میكرۆبی دروستبكات بـۆ بەدبـەختكردنی مـرۆڤ، هـەرگیز ئامـادە نـی یـە هێـرۆئین و كۆكـائین پێـك بهێنێت، هـەرگیز ئەمانـە ناكـات چـونكە لەسـەرەتادا لـە شەخسـیەت و بـون و

مرۆڤانەی خۆی بەشێوەیەکی باش بەهرەمەنـد بـوەو تێگەیشتوە، لەبـەر ئەمـە لەکارەکانی دوایدا، باش هەڵوێست وەردەگرێت.

ئەم سەرگەردنی یەو ئەم هـەمو بەرنامـەو کـرداره نادروستانەی، کـە مـرۆڤ هەیەتی و ئەو هەڵس و کـەوت و دەسـت تێوەردانـە هەڵەیـە، کـە لـە بونـەوەردا دەیکات و ئەم بەکارهێنانە نادروسـتەی لـە زانسـت و توانـای خـۆی دەیکـات، کـە دەبێتە هۆی دروستکردنی هەندێ شت، کە دەبێتە مایەی نـابوتی و بەدبـەختی مرۆڤ وەك کاری ئەو کەسە وایە، کە نازانێت ژمـاره چیـە، بـەلام بنـەماو یاسـاو مەسـەلە جۆراوجۆرەکـانی ماتمـاتیکی لەبەردەسـت دایـە، ئەگـەر پێـی بوترێـت خانویەك دروست بکە شتێك دروست دەکات، کە بەسەر خەڵکی دا دەڕوخێت و بە کوشتنیان دەدات و نەخشەو حیسابەکەی هەڵە دەردەچێت، هۆی هـەمو بـەد بەختیەکانی، کە بەسەر مرۆڤدا هاتوە ئەمەیە.

بنەمای پەروەردەی ڕاست و دروسـتی دینـی ئەمەیـە کـە هەنـدێ شـت بـە – اصول- دەزانێت، کە لە ڕاستیشدا –اصول-ن و ناسینی سەرەکی و ژێرخـانین بـۆ ناسینی هەمو شتەکان، ناسـین و زانینـی ڕازەکـانی بـونی مـرۆڤ وبونـەوەر کـە: بونەوەر لە خۆیەوە بەدی نەهاتوەو ئەم شێوەیەی لەخۆیەوە بـەدی نـەهێناوەو ئەم ڕێك و پێکی یە بە خۆڕایی نییە، ئەمانە یەکەمین وشـەو سـەرەتایی تـرین وەلام و شـیکردنەوەیە، کـە مـرۆڤ بـۆ وەلامـی ئـەو پرسـیارەی بونـەوەر چیـە پەیدای دەکات.

پاشان مرۆڤ دروستکراوێك نیـە هـەرواو لـە خۆیـەوە بەڕێکـەوت ئـەم شـێوە گـەورەو ئـالۆزەی پەیـدا کردبێـت، بـە ڕێکـەوت ڕێـی کەوتبێتـە گـۆی زەوی و هەرچۆنێك ویستی باش، یان خراپ لەم سەر زەمینـە بجولێتـەوە، خالقێـك، کـە ئەم بونەوەرەی بەم ڕێك و پێکیە دروست کردوە ئەم توانایەشی داوە بە مرۆڤ، کە سودی لێ وەربگرێت، بەهرەی فراوان و کەرەسەی زۆری بەخشیوە بە مـرۆڤ، هەروەها توانـای زۆری پێدراوە تـا لـەو بەهرانـە سـود وەربگرێـت، بونـەوەر بـۆ مـرۆڤ و مرۆڤ گونجاوە لەگەڵ بونەوەردا.

پاش ئەمانە دەزانـین مـرۆڤ یـەك لایەنـە نیـە وەكـو گیانـداران، كـە یـەك لایەنەیە) بەڵكو دروستكراوێكە بەسەدان لایەنەوە، مرۆڤ دەتوانێت لە مەیدانی چـاكی و خراپـی دا سـەدان جـۆر بـژی، هـەر ئەمـە دەری دەخـات، كـە دروستكراوێكی سادە هەروەها نیـە، كـە وەك بـاقی گیانـداران بمرێـت و ئـیتر تەواو، نەخێر لەلایەكەوە، كە ئەم هەمو شتەی پێدراوە، پاشـان توانـای ئـەوەی، كە دەتوانێت ئەم شتانە بە هەڵە، یان بەڕاست بـەكار بهێنێـت و بـۆ خـۆی و بـۆ خەڵك چاكترین، یان خراپ ترین مرۆڤ بێت، بەڵگەن بۆ ئەوەی، كە ئایندەیـەك لەگۆڕێ دایەو پاش مەرگ ژیان كۆتایی نایە چونكە ئەگـەر ٧٠ یـان ٨٠ یـان ١٠٠ یان ٢٠٠ یان ١٠٠٠ ساڵ تەمەن بدرێت بە مرۆڤ دیسان كەسانێك پەیدا دەبن، كە ئەگەر ٢٠ سـاڵ خراپـە بكـەن بـە ئەندازەیـەك خراپـە دەكـەن، كـە بـاقی هـەزار ساڵەكە بۆ سزادان و وەرگرتنی مافی خەڵكی تـەرخان بكـەیت پـێ ڕانەگـەیت و بەس نەبێت، كەسێك، كە ملیۆنەها مرۆڤ توشی ڕەنج و ئـازاری گـەورەو بچـوك دەكات و نەخشەی هێندە خائینانە دادەنێت، كە ئەگەر هۆكاری دەرەكی نەبێتە ڕێگر بۆی هەتایـە هەتایـە مرۆڤایـەتی دامـاو دەبێـت بەدەسـتیەوە، ئەگـەر ئـەم كەسـە ٢٠ سـاڵ خیانـەت بكـات و بـاقی هـەزار سـاڵەكەی تەمـەنی بـە سـزاوە بگوزەرێنێت ئایـە هـەقی زەرەرو زیـان و ڕەنـج و ئـازاری خـەڵك كراوەتـەوە؟ بێگومان نەخێر، مرۆڤایەتی مەزلوم بەدەست ئەم خائینانە توشی سەرگەردانی و بەدبەختی و نەزانی و زوڵم و (ئیمتیازات) زیادە بە شانەی ناهەق و فـەرق و فروقێك ئەبێت، كە كۆتایی نایە، لە بەرامبەردا، ئەگـەر كەسـێك پەیـدابێت بـۆ نمونـە ئـەم هـەزار ساڵەی تەمـەنی خـۆی لـە ڕێگـای چاكەو خزمـەتی خەڵكـدا بەسەر ببات ئەگـەر ١٠ هـەزار سـاڵی تـر بژی ئایـە دەتوانرێـت پاداشـتی خێـرو چاكەیەك كە مرۆڤایەتی لە ڕەنج و زەحمەت و فیداكاری ئەو بەدەستی كەوتوە پێی بدرێتەوە؟ هەرگیز.

مـرۆڤ بـە تێكڕایـی ئەمـەی دەرك كـردوە، كـە ئـەم دروسـتكراوە ئـاڵۆزە بـەم ئیختیـارە فراوانـەو ئـەم هـەمو پێداویسـتیە زۆرەوە، كـە لەبـەر دەسـتی دایـە

دروستکراوێك نیە، کە چوار ڕۆژی تەمەنی دنیا بۆ سزای خراپەکان و پاداشتی چاکەکان بەس بێت، دەورانی ژیانی دنیا زۆر کەمترە لەوەی، کە بتوانێت بۆ دەورانی پاداشت دەست بدات، لەگەڵ ئەمەشدا کاتێ سەیری واقیع دەکەین دەبینین، کە هەندێك لە مرۆڤەکان تا دوا هەناسەی تەمەنیان هەر خەریکی خیانەتن بە خەڵکی و یەك ڕۆژیش سزای ئەم خیانەتەیان نەدیوەو دەمرن، کەسانێکی تر هەمو تەمەنیان تەرخان دەکەن بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی و لەپێناوی ڕزگاری مرۆڤ، لە چنگی زوڵم و زۆرو فەسادو درۆو فریوکاری تەزویردا سەختی و ڕەنجێکی زۆر دەکێشن و تا دوا هەناسەی تەمەنیان یەك ڕۆژ بە خۆشی و ئاسایش ناژین و دەمرن، چۆن پاداشتی ئەم کەسە چی لێ هات؟

مرۆڤایەتی و ویژدانی هۆشیاری مرۆڤ ئەمە دەزانێت و دەرکی دەکات، کە ئەمانە هەروا بەهەدەر ناڕۆن و ون نابن، ئەوەی هەر خراپەیەکی کرد هەروا ڕابردو ئیتر هیچ؟

وە ئەوەی هەر چاکەیەکی کرد تەواو بێت و بڕوات؟

ویژدانی قوڵی مرۆڤانە دەزانێت کە نەخێر بەم شێوەیە نیە، چونکە ئەگەر ویژدانی مرۆڤ ئەمەی دەرك نەدەکرد هیچ کاتێك نەیدەوت: چاکی و خراپی، چاکی و خراپی مانای چی یە؟

کاتێك مرۆڤ هەر خراپەیەکی کردو ئیتر تەواو لێ پرسینەوە نەبێت ئەوەی تر هەم کارێکی چاکی کردو ئیتر تەواو هیچ پاداشتێك لە نێوانیاندا نەبێت، کەواتە چاکی یانی چی؟ خراپی یانی چی؟

بەڵام ویژدانی مرۆڤ ئەمە دەزانێت، کە نەخێر ئەم کەسە خراپە دەکات و خیانەت دەکات، ئەو کەسەی چاکە دەکات و خزمەت دەکات، وەك یەك نیەو دەشزانێت، کە سەرئەنجامی هەردوکیان وەك یەك نیە، کەی لەم دنیایەدا ئەنجامی چاکی، یان خراپی دەردەکەوێت؟

تەمەنی هەمومان تەواو بو، چاکەکان و خراپەکان هەمویان مردن و هیچ کەس پاداشتی نەدی.

دین سەرەتا ئەم وشە سەرەکی یانە فێری ئێمە دەکات، نە شتە فەرعییەکان، لەبەر ئەوەی سادە فێرمان نەکات و بۆ ئەوەی حاڵمان وەك ئەو کەسە نەبێت، کە هێشتا ژمارە نازانێت هەوڵ دەدات مەسەلە ئاڵۆزەکانی ریاضیات حەل بکات، سەرەتا لە مەسەلە سەرەکی یەکانی بونەوەر و خۆمانەوە فێرمان دەکات، کە بونەوەر شتێکی رێکەوت و بێ سەرەتاو ئەنجام نیەو مرۆڤیش مەوجودێکی بەرەڵاکراو نیە، کە ئەگەر کردەوەی خراپ، یان چاك ئەنجام بدات جیاوازی نەبێت بۆی.

پاش ئەم مەسە سەرەکی یانە زانینمان دەربارەی مرۆڤ و بونەوەر زیاتر دەکات، هەر لەبەر ئەمەیە هەرچی بەرەو پێش دەڕۆین و زۆرتر دەزانین هەموی بەسود و بەجێ دەبێت، چونکە بنەمای دەرك و تێگەیشتنمان وڕەوشتمان لەسەر بنەمایەکی رێك وپێك و دروست دانراوە.

هۆکاری سەرەکی لەمەدا، کە دین پەروەردەکردنی خستۆتە پێش فێرکردنەوە ئەمەیە، نەك ئەوەی هیچ شتێك فێری مرۆڤ نەکات، یان بەبێ ئەمەی ناسین و زانینی پێ بدات پەروەردەی بکات، بەم شێوەیە هەرگیز نابێت، لەبەر ئەوەی لە جیهان بینی دین دا پەروەردە واتە: دروست کردنی شەخسیەتی مرۆڤ هاوشان و گونجاو لەگەڵ ناسینەکانی دا.

لەبەر ئەمە دین لەسەرەتادا زانینە سەرەکی یەکان فێری مرۆڤ دەکات، چونکە ئەم زانینانە دروست و بەجێن و لە رۆح و رەوانی مرۆڤدا جێی خۆیان دەکەنەوە، رۆح و رەوان و باقی هەل و مەرجەکانی تر، کە بۆ پێکهێنانی شەخسیەتی مرۆڤ پێویستن و گەشەی پێ دەکەن.

لە کۆڕی پێشودا وتمان:

١- کە جێبەجێکردنی گشتی و هاوهەنگاو یەك جۆر.

٢- هەروەها بونی پەروەردەکەرێکی خاوەن شەخسیەتی رێك و دروست.

(ئەم دوو مەرجە سەرجەم) زەمینە ساز دەکەن، کە ئەو ناسین و زانینە سەرەکییانە لە مرۆڤدا بەکار بکەن، شەخسیەتێکی ڕێك وگونجاوی وێڕای زانینەکانی پێ بدات.

واتە: ئەگەر شێوازێکی دروستی پەروەردەکردن هەبێت، ئەوجا مرۆڤ بە دروستی پەروەردە دەبێت، پاش پەروەردە کردن وردە وردە زانستی زیاتری دەست دەکەوێت.

دەبینین مرۆڤ (سەرجەم) زۆربەیان دەکەونە هەڵەوەو گومان دەکەن و وادەزانن، کە – زانست- یان – فەرهەنگ - (ڕۆشنبیری) مایەی ڕزگاری مرۆڤە لەکاتێکدا زۆر هەڵەیە، زانست و نە کەلتور هیچیان مایەی ئاسودەیی مرۆڤ نین بەتەنها.

زۆر میللەت هەن، کە خاوەنی فەرهەنگی زۆر گرنگ و گەورەن، بەلاّم خۆیان هیچ و پوچ و نەگبەتن و پەروەردە کردنیان لەسەر بنەمای خێرو خێرخوازی نیە، هەرچەن لە ڕواڵەت پێشکەوتون، بەلاّم پوچن.

تەنانەت دەبینین کە لە قورئاندا لە پێغەمبەرێکی گەورەی وەك ابراهیم(عليه السلام) لەکاتی بەجێ هێشتنی خێزانەکەی و منداڵەکەی لە دەورو بەری ماڵی خوادا لەو بیابانەدا چەند دوعایەك دەگێڕێتەوە کە بۆ نەوەکانی و ئایندەیان دەکات کە یەکێکیان ئەمەیە ﴿ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾(سورة البقرة: الآية١٢٩) سەرنج دەدەین، کە ابراهیم(عليه السلام) هەروەك دەرك و زانینی گشتی مرۆڤی سەدەی بیستەم وای زانیوە، کە بنەمای سەرەکی ئەوەیە کە خەڵك زانستی فراوانیان هەبێت، پاشان پەروەردە دەبن.

بەلاّم قورئان کاتێك حاڵەتی هەمیشەیی تایبەتی پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) بەیان دەکات کە نەخێر پێوانەی بایەخدار بۆ مرۆڤ سازی بەشێوەیەکی ترە ﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ

ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ (سـورة البقـرة: الآيـة ١٥١) حالێمـان دەكـات، كـه ئـەوەی لـه دوعاكـەی ابـراهيم(عليه السلام)دا لـه قۆنـاغی چوارەمدا بەمـەرج گـيراوەو پێشـبينی كراوه يەكسەر دوای بانگەوازی گشتی بەرەو هيدايەت دەست پێ دەكات و دوای —يزكيكم- ه كه —تعليم كتاب وحكمت- دەست پێ دەكات، ئەمـه كورتەيـەك بـۆ لەو باسەی كه لەكۆڕی پێشودا باس كرا.

ڕازی ئەوەی له ئيسلامدا تـا ئـەم ئەندازەيـه بايـەخ دراوه بـه پـەروەردە، كـه دەكەوێتـه پـێش فێركردنـەوە (لـه كاتێكـدا پێشـبينی مـرۆڤ هەميشـه بـه پێچەوانەوە بـوە ) ئەوەيـه، كـه لـەبارەی پـەروەردە وتمـان، واتـه: لەسـەرەتاداو پێش هەر شتێك زانست و زانينه سەرەكيەكان بزانێت و شەخسيەتی لەگەڵيـدا گەشه بكات و تەنيا پاش ئەمەيە زانياری يەكانی زياتر بكات.

نەخۆشی دنيای ئەمڕۆ لەبەر دوو هۆيە:

١- وا هەسـت دەكـەن كـه فێركـردن گرنگـه (لـه ئێرانـدا بـەڕەسمی دەڵێن — وەزارەتی فێركردن و پەروەردە — فێركردن پێش پەروەردە خراوە).

٢- وا هەست دەكەن، كه پـەروەردە ئەمەيە، كـه: مـرۆڤ بكرێتـه گيانـدارێكی بێ هەست و دەرك و بەزۆرە ملێ پێی بوترێت ئەمه، يان ئەوە بكـه، يـان وشـك و بێ مەنتيق هەڵس و كەوت و ڕەفتارێكی فێر بكرێت، بەم شێوەيە كه مرۆڤـی ئەم سەردەمە دەيبينين كه دەڵێن ئەمانه (مبادئ آداب)ن و (معاشرتين) كـه لـه ڕاستيدا واته مەيمونن، تەنيا ئەمەو ئيتر هيچ.

دنيـای ئـەمڕۆ ئەمـەی دەرك نـەكردوە لـه كاتێكـدا وەك ڕونمـان كـردەوە، پەروەردە لەپێش فێركردنەوەيە، پەروەردە بەو مانايە نيە، كـه بـەزۆری ياسـا، يان بە خاتری فەرهەنگ وداب و نەريت بـه مـرۆڤ بوترێـت، ئەمـه بكـەو ئەمـه مەكە نەخێر ئەمە نيە، بەڵكو پەروەردە ئەمەيە، كە لەسەرەتادا بەنەماو خاڵـه سەرەكی يەكانی هەمو ئەو شتانەی، كـه بڕيـارە لـه ئاينـدەدا فێربێت، بزانێت، دوای فێربـونی خاڵـه سـەرەكی يـەكانی شەخسـيەتی بـەپێی ئـەو زانينـه گەشـه

بكات، ببێتە گۆڕێ واتە لە – دڵ - دا جێگیر بێت و تەنیا – زانینی هۆشی- نەبێت و بگۆڕێت بەتێگەیشتن و دەرك كردن و باوەڕ-ئیمان-.

كەواتە بەرنامەی ئێمە لەم دەرسانەدا بریتیە لەو مەسەلەیەی، كە وتمان، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتمان كە: ئێمە لە ئەرك و فەرمانی ڕابەران و مامۆستایانی ئەم پەیمانە قورئانی یە وا تێگەیشتوین كە:

١- گەیاندنی پەیامی ئاسمانی قورئان: ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا﴾ (سورة البقرة: الآية ١٥١) پاشان یەكسەر قۆناغی پەروەردە دێت بۆ ئەو كەسانەی كە نیەتێكی سالم و ئامانجێكی دروستیان هەیەو وەڵامی بانگی هەق دۆسنی وپارێزگاری هەق دەدەنەوە.

٢- مەبەست ئەمەیە كە هەمو مرۆڤێك كاتێك بانگی هەق دەبیستێت وەڵام دانەوەو كاردانەوەیان وەك یەك نیە، مرۆڤایەتی بەپێی شێوەی بیركردنەوەو ڕۆحیەو ئاوات وئارەزوەكانیان و شێوەی ژیانیان لەبەرامبەر بانگەوازی حەقدا حاڵاتی جۆراوجۆریان دەبێت، هەندێكیان زۆر بێزارو توڕە دەبن، چونكە بانگی هەق لەبەرامبەر باوەڕوبیركردنەوەیاندا ڕاوەستاوە.

هەروەك و هەندێ لەو خەڵكە مەزڵوم وفریودراوە، كە سەر بە سۆفی گەرین، بەڵام لە ڕاستیدا دوچاری شرك و بت پەرستی (نائاگاهانە) بون كاتێك بانگی توحید دەبیستن (كە لە كرۆكدا دینی خوا واتە توحید) ناڕەحەت و توڕە دەبن، تەنانەت بیستومە كەلە كۆڕێكدا باسی من كراوە یەكێك لەو مەلایانەی – كە تەنیا ناوی مەلایە – وتویەتی وێڵی بكەن – ئەو موحدە- و بەكەڵك نایەت و بۆ باس كردن نابێت، زۆر سەیرە مەلا بێت و ڕابەری دین بێت و بێزاری خۆی دەربڕێت لە كەسێك لەبەر ئەوەی –موحدە-.

كەواتە دین یانی چی؟

واتە: شرك؟!

كەسێك بەم بیرەوە كاتێك بانگی هەق دەبیستێت بێ شك نارەحەت دەبێت و كاردانەوەی توندو تیژی دەبێت، چونكە خۆی لەو جۆرە بیركردنەوەدا نوقم بوەو تەواوی خۆشەویستی هەست و بیرو ئارەزوەكانی لەسەر ئەم جۆرە بیره دامەزراوه، مەگەر كاتێك وردە وردە هەنگاو هەنگاو كاری لەگەڵدا بكرێت، تا بنەمای ئەو بیره هەڵەو نا دروستەی ئێستای سست بێت، هێواش هێواش بەرەو رێگای راستەقینە بگەرێتەوە.

جـۆرێكی تـر هـەن لەبـەر ئـەو شـێوە ژیانـە ماددی یـەی، كـە بۆخۆیـان هەڵبژاردوە لە بانگەوازی هەق بێزارن، كەسێك بە زیادە بەشانەوە -ئیمتیازات- دەژی و بـە فیـزو خـۆ بەگـەورە زانینـەوە دەژی و نازدەكات بەسـەر خەڵكداو دەیان چەوسێنێتەوە، هەق وردو داغانی دەكات بێ شك، كە نارەحەت دەبێت، چونكە هەمو زیادە بەشانەكەی لەناو دەچێت.

هەن كەسانێك، كە نە بیروباوەریان پوچ و فاسیدو شێواوەو نە ژیانیان بەو جۆرەیە دژ بە خەڵك بێت.

یـان لەوانەیـە بـیرو بـاوەری خـراپ بێت، ژیانیشی بـە زەرەی خـەڵك، بـەڵام بەتەواوی لە هەمو لایەنێكەوە رەش و تاریك نەبوە، ئەم كەسانە بەپێی رادەی تایبەتمەندی رەوشتیان و لایەنە جۆراوجۆرەكانی گـرنگ لـە ژیانیاندا دابـەش دەبن بە پلەی جۆراوجۆردا.

دانـە دانەیـەك هـەن، كـە زۆر زودەنگـی هـەق دەبیسـتن و حـاڵی دەبـن، كـە كۆمەڵەكەیان چەند فاسدو پوچ و پیسـە بـەو پـەری توانـاوە پێشـواری نـە هـەق دەكەن.

هەن كەسانێك تا ماوەیەك لە گوماندا دەبن و وردە وردە بەرەو هەق دێـن و هـەن كەسـانێك گومانیـان زیـاترە، بـەڵام جگـە لەمانـەی كـە باسـكرا دەسـتەی چەوسـێنەر -مـلا- ئەوانـەی، كـە رەنگـی گشـتی ژیـان و بـیرو بـاوەرە ئەخلاقیەكانیان لەسەر بناغەی زیادە بەشانە-ئیمتیازات- دامـەزراوەو بـەخۆیان دەڵێن -ماقوڵ- و بەخەڵك دەڵێن ناماقوڵ- و بایەخ زیاتر بۆ خۆیـان دادەنـێن

و بۆ خەڵك هیچ،ئەو دەستەیە زۆر سادەو ئاسایی ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ (سورة البقرة: الآية ٦) ڕێگای ئەمانە ڕێگای –ئیمان – نی یە، كاتێك مەسیری ژیانیان بەم شێوەیە بێت و ماوەیەكی زۆر دەنگی هەق بەشێوەیەكی پاك و ڕۆشن بگاتە گوێ، یان و دیسان دوژمنی وداكۆكی بكەن بەو شێوەیەی، كە قورئان پێمان دەڵێت ئەمانە –كافرن- واتە كەسانێكن كە هەوڵ دەدەن هەق داپۆشن، هەق گوم بكەن هەق لەخەڵكی پەنهان بكەن، ئەمانە ئیدی ناتوانن پەیڕەوی لە هەق بكەن.

بەڵام ئەو كەسانەی تر، كە هەمو شتەكانی وەك سیفەتە جۆراوجۆرەكان و بڕیاردان و چۆنیەتی ژیانیان زەمینەیان بۆ ساز دەكات، كە پەیڕەوی لە هەق بكەن بەرەو هەق هەنگاو هەڵدێنن و پەروەردە كردنیان دەست پێ دەكات، ژیانیان ڕۆشن دەبێتەوە.

دەبینین محمد( ﷺ) لە مەكە فەرمانبەری و ئەركی بەندایەتی دەكەوێتە سەر شانی، یەكەم جار پێش هەر كەس هاوسەرەكەی خاتو خدیجە باوەڕی پێ دەهێنێت ئەمەش یەكێكە لەو خاڵە گرنگانە.

حەساسترین مرۆڤ بە مرۆڤێكی تر ژنە لەبەرامبەر مێردەكەیدا، ئەگەر كەمترین كەم وكوڕی ناموسی و ڕەوشتی لە محمد دا ( ﷺ) هەبوایەو لەگەڵ ئەوەدا، كە داوایەكی ئاوا گەورەی دەكرد هەوەڵین كەسێك، كە بەهەمو شێوەیەك دوژمنایەتی دەكرد هاوسەرەكەی دەبو، لە كاتێكدا كە هەقیقەت هێستا بەتەواوی بۆ محمد ﷺ ڕون نەبوبۆوە تەنیا ئەوەبو، كە بانگی ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾ (سورة العلق: ١) دوای ئەوەی دووچاری ئەو ناڕەحەتی و تاو لەرزە زۆرە بو، مەسەلەكەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە، خاتو خدیجە لە كاتێكدا كە دڵی دەدایەوە پێی وت هەرچی بێت شەڕو بەڵا نیە، چونكە ژیانی تۆ بەشێوەیەكی گشتی وانیە، كە شەڕو بەڵات بۆ بێتە پێش، تا كاتێك چونە لای –وەرەقەی

بکات، بێتـە گۆڕێ واتـە لـە – دڵ - دا جێگیر بێـت و تـەنیا – زانینـی هۆشـی- نەبێت و بگۆڕێت بەتێگەیشتن و دەرك كردن و باوەڕ-ئیمان-.

کەواتە بەرنامەی ئێمە لەم دەرسانەدا بریتیـە لـەو مەسـەلەیەی، کـە وتمـان، لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا وتمـان کـە: ئێمـە لـە ئـەرك و فـەرمانی ڕابـەران و ماموستایانی ئەم پەیمانە قورئانی یە وا تێگەیشتوین کە:

١- گەیاندنی پەیامی ئاسمانی قورئان: ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا﴾ (سورة البقرة: الآية ١٥١) پاشان یەکسەر قۆناغی پەروەردە دێت بۆ ئەو کەسانەی کە نیەتێکی سالم و ئامـانجێکی دروسـتیان هەیـەو وەڵامـی بـانگی هـەق دۆسـتی وپارێزگـاری هـەق دەدەنەوە.

٢- مەبەست ئەمەیە کە هەمو مرۆڤێك کاتێك بـانگی هـەق دەبیستێت وەڵام دانەوەو کاردانەوەیان وەك یەك نیـە، مرۆڤایـەتی بـەپێی شـێوەی بیرکردنـەوەو ڕۆحیەو ئاوات وئارەزوەکانیان و شێوەی ژیانیان لەبەرامبـەر بانگـەوازی حەقـدا حاڵاتی جۆراوجۆریان دەبێت، هەندێکیان زۆر بێزارو تورە دەبن، چونکە بـانگی هەق لەبەرامبەر باوەڕوبیرکردنەوەیاندا ڕاوەستاوە.

هـەروەك و هەنـدێ لـەو خەڵکـە مـەزلوم وفریـودراوە، کـە سـەر بـە سـۆفی گەرین، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا دوچاری شـرك و بـت پەرسـتی بـون کاتێـك بـانگی توحیـد دەبیسـتن (کە لـە کرۆکدا دینـی خـوا واتـە توحیـد) نارەحـەت و تـورە دەبن، تەنانەت بیستومە کەلە کۆڕێکدا باسی من کـراوە یـەکێك لـەو مەلایانـەی – کە تەنیا نـاوی مەلایـە – وتویـەتی وێڵی بکـەن – ئـەو موحـدە- و بەکـەڵك نایـەت و بـۆ بـاس کـردن نابێـت، زۆر سـەیرە مـەلا بێـت و ڕابـەری دیـن بێـت و بێزاری خۆی دەرببڕێت لە کەسێك لەبەر ئەوەی –موحدە-.

کەواتە دین یانی چی؟

واتە: شرك؟!

کەسێك بەم بیرەوە کاتێك بانگی هەق دەبیستێت بێ شـك ناڕەحـەت دەبێـت و کاردانەوەی توندو تیژی دەبێت، چونکە خۆی لەو جۆرە بیرکردنەوەدا نوقم بوەو تەواوی خۆشەویستی هەست و بیرو ئارەزوەکانی لەسـەر ئـەم جۆرە بـیرە دامەزراوە، مەگەر کاتێك وردە وردە هـەنگاو هـەنگاو کـاری لەگەڵدا بکرێـت، تـا بنەمای ئەو بیرە هەڵەو نا دروستەی ئێستای سست بێت، هێواش هێواش بـەرەو ڕێگای ڕاستەقینە بگەڕێتەوە.

جـۆرێکی تـر هـەن لەبـەر ئـەو شـێوە ژیانـە ماددی یـەی، کـە بۆخۆیـان هەڵبژاردوە لە بانگەوازی هەق بێزارن، کەسێك بە زیادە بەشانەوە —ئیمتیازات- دەژی و بـە فیـزو خـۆ بەگـەورە زانینـەوە دەژی و نازدەکـات بەسـەر خەڵکـداو دەیان چەوسێنێتەوە، هەق وردو داغانی دەکات بێ شك، کە ناڕەحـەت دەبێـت، چونکە هەمو زیادە بەشانەکەی لەناو دەچێت.

هەن کەسانێك، کە نە بیروباوەڕیان پوچ و فاسـدو شـێواوەو نـە ژیانیـان بـەو جۆرەیە دژ بە خەڵك بێت.

یـان لەوانەیـە بـیرو بـاوەڕی خـراپ بێـت، ژیانیشـی بـە زەرەی خـەڵك، بـەڵام بەتەواوی لە هەمو لایەنێکەوە ڕەش و تاریك نەبوە، ئەم کەسـانە بـەپێی ڕادەی تایبەتمەندی ڕەوشتیان و لایەنـە جۆراوجۆرەکانی گـرنگ لـە ژیانیانـدا دابـەش دەبن بە پلەی جۆراوجۆردا.

دانـە دانەیـەك هـەن، کـە زۆر زودەنگـی هـەق دەبیسـتن و حـاڵی دەبـن، کـە کۆمەڵەکەیان چەند فاسدو پوچ و پیسـە بـەو پـەڕی توانـاوە پێشوازی لـە هـەق دەکەن.

هەن کەسانێك تا ماوەیەك لە گوماندا دەبن و وردە وردە بەرەو هەق دێـن و هـەن کەسـانێك گومانیـان زیـاترە، بـەڵام جگـە لەمانـەی کـە باسـکرا دەسـتەی چەوسـێنەر —مـلاَ — ئەوانـەی، کـە ڕەنگـی گشـتی ژیـان و بـیرو بـاوەڕە ئەخلاقیەکانیان لەسەر بناغەی زیادە بەشانە-ئیمتیازات- دامـەزراوەو بـەخۆیان دەڵێن —ماقوڵ- و بەخەڵ دەڵێن ناماقوڵ — و بایەخ زیاتر بۆ خۆیان دادەنـێن و

بۆ خـەڵك هیچنـەو دەستەیە زۆر سادەو ئاسایی ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ (سورة البقرة: الآية ٦) ڕێگای ئەمانـە ڕێگای –ئیمـان – نـی یـە، كاتێـك مەسـیری ژیانیـان بـەم شـێوەیە بێـت و ماوەیـەكی زۆر دەنگـی هـەق بەشێوەیەكی پاك و ڕۆشن بگاتە گوێ، یان و دیسان دوژمنی وداكۆكی بكەن بەو شێوەیەی، كە قورئان پێمان دەڵێت ئەمانە –كافرن- واتـە كەسانێكن كـە هـەوڵ دەدەن هـەق داپۆشـن، هـەق گـوم بكـەن هـەق لەخـەڵكی پـەنهان بكـەن، ئەمانـە ئیدی ناتوانن پەیڕەوی لە هەق بكەن.

بەڵام ئەو كەسانەی تر، كە هەمو شتەكانی وەك سیفەتە جۆراوجۆرەكـان و بڕیاردان و چۆنیەتی ژیانیان زەمینەیان بۆ ساز دەكات، كـە پـەیڕەوی لـە هـەق بكـەن بـەرەو هـەق هـەنگاو هەڵدێنن و پـەروەردە كردنیـان دەسـت پـێ دەكات، ژیانیان ڕۆشن دەبێتەوە.

دەبینین محمد( ﷺ) لە مەكـە فەرمانبـەری و ئـەركی بەندایـەتی دەكەوێتـە سـەر شـانی، یەكـەم جـار پـێش هـەر كـەس هاوسـەرەكەی خـاتو خدیجـە (رضي الله عنها) باوەڕی پێ دەهێنێت ئەمەش یەكێكە لەو خاڵە گرنگانە.

حەساسـترین مـرۆڤ بـە مرۆڤێكـی تـر ژنـە لەبەرامبـەر مێردەكەیـدا، ئەگـەر كەمترین كەم وكوڕی ناموسی و ڕەوشتی لـە محمـد دا ( ﷺ) هەبوایـەو لەگـەڵ ئـەوەدا، كـە داوایـەكی ئـاوا گـەورەی دەكـرد هـەوەڵین كەسـێك، كـە بەهـەمو شـێوەیەك دوژمنایـەتی دەكـرد هاوسـەرەكەی دەبـو، لـە كاتێكدا كـە هەقیقـەت ئێستا بەتەواوی بۆ محمد ﷺ ڕون نەبوبۆوە تەنیا ئەوەبو، كە بـانگی ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾ (سورة العلق: ١) دوای ئەوەی دووچاری ئەو ناڕەحەتی و تـاو لـەرزە زۆرە بو، مەسەلەكەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە، خاتو خدیجـە لـە كاتێكدا كـە دڵـی دەدایەوە پێی وت هەرچی بێت شەڕو بەڵا نیە، چونكە ژیـانی تـۆ بەشـێوەیەكی گشتی وانیە، كە شەڕو بەڵات بۆ بێتـە پـێش، تـا كاتێـك چونە لای –وەرەقـەی

ئامۆزای خدیجە، محمد ( ﷺ) زۆر نیگەران بو كە ئەم مەسەلە قورس و گران و گەورەیە دەبێت چی بێت؟ وەرەقە ڕونی كردەوە (چونكە ئەو شارەزابو) خاتو خدیجە باوەڕی پێ هێنا شەخسیەتی سالم و پەسەندكراو وبەجێ ئەمەیە، گەورەترین نیشانەی پاكی و صەداقەتی محمد(ﷺ) ئەم هەڵوێستەی خاتو خدیجەیە، چونكە ژن ئەم هەمو حەساسیەتەی هەیە لە پیاو لەكاتێكدا ئەم ژنە ١٥ ساڵ لە مێردەكەی گەورەترە، مێردەكەی ٤٠ ساڵەو خۆی ٥٥ ساڵ و هەمو ماڵ و سامانی مێردەكەشی هی ژنەكەیەتی، تا چ ڕادەیەك پاكی و دروستی لە شەخسیەتی ئەم مێردەیدا دەبینێت، كە مەسەلەیەكی ئاوا گەورە، كە مێردەكەی دەیكات باوەڕی پێ دەهێنێت، لە ڕاستیدا ئەم پەیامە هەمو دەست كەوت و بایەخەكانی تەمەنی ٥٥ ساڵەی خدیجە دەنێتە لاوە لەگەڵ ئەمەشدا پێش هەر كەسێكی تر باوەڕی پێ دەهێنێت.

پاشان لە نێوان منداڵاندا علی و لەنێو پیاواندا ابوبكر و لەنێوان عەبدەكاندا زید باوەڕی پێ دەهێنن، كە ئەمانەش وەك خاتو خدیجە نزیكن لە محمد ( ﷺ) و لە ژیان و ڕەوشت و شەخسیەتی ئاگاداربون، بەهەمان شێوە هەمو ئەو كەسانەی، كە لە كۆمەڵگای گەورەی مەكەدا بون.

بەڵام لەهەمان كاتدا ژمارەیەك ڕاستەوخۆ كەوتنە دژایەتی محمد( ﷺ) و پەیام و بەرنامەكەی و تا كۆتایی تەمەنیان دژی وەستان، مەگەر كەسانێك، كە زەمینەی دوژمنایەتیان نەماو ناچاربون تەسلیم بن.

ئەگەر سەرنجێكی ئەو ١٣ ساڵەی مەككە بدەین، كە محمد( ﷺ) كاری تێدا دەكرد دەبینین كە تەنیا ژمارەیەكی دیار بەرەو ئەوفاتن و لەبەرنامەی پەروەردەیی ئەو سودیان وەرگرت، بەڵام هەمان ژمارەی دیارو ناسراو، كە هەر ئەوانە بون دنیایان ژێروڕوكرد لەبەر ئەوەی بە دروستی پەروەردە بو بون، دوای ئەوەی پەروەردە بون بەردەوام ئایات دەهاتە خوارەوەو زانینیان زیادی دەكرد.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە کۆچ دەکات و ژێرخان و پایەی سەرەکی کۆمەڵگای مەدینە مهاجرین و پاشان –انصار- کە انصارەکانیش زۆربەیان پێش کۆچی محمد ﷺ باوەڕیان هێنابو، چ ئەو ١٢ کەسەی دوو ساڵ پێش کۆچ کردن وەك وەفـدێکی نوێنـەر بـە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) گەیشـتن چ ئـەو ٧٢ کەسەی، کە ساڵێك پێش کۆچ کردنی پێغەمبەریان (ﷺ) دی و باوەڕیـان بـە دینەکەی کردو چ کەسانێك، کە دینیـان لەسـەر دەستی ئـەم کەسانەدا ناسیبو، باوەڕیـان پـێ هێنـابو ئەمانـە ئـەو مرۆڤـە پاکانـە بـون کـە پێش کۆچ کردنـی محمد(ﷺ) ئیسلامیان درك کردبو (ئەمانە ناوکی سەرەکی کۆمـەڵی ئیسلامیان پێك دەهێنـا لـە ڕوی ژمـارەوە زۆر کـەم بـون، بـەڵام لـە ڕوی چۆنیەتی و ڕوە عەمەلیەکەی ئـەو نمونەیـە بـون، کـە قورئـان باسـی دەکات (هەڵبەتـە –مثـل- ڕاســـتترە) ﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ ﴾ (سورة الحشر: من الآية ٢١) هەر دوابەدوای ئایەتەکە حاڵیمان دەکات، کە ئایە قورئان بۆ سەر کێو دێتە خوارەوە؟

نـەخێر ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾ (سـورة الحشـر: الآيـة ٢١) بەشـێوەی – مثال- ئەم شتەمان فێر دەکات.

کۆمەڵگای ئیسلامی وەك قورئان دەڵێت: هێندە بچوك و بێ هێز بو، کە هەر نەیهێڵن، بەڵام کۆمەڵگاکانی شیرك، کۆمەڵگاکانی پڕ لە ئیمتیاز و بەندە بون، چ تیرەکـانی دورگـەی عـەرەب، چ حکومەتـە ژێـر دەسـتەکانی ئێـران و ڕۆم لـە ناوچـەکانی بـاکور و باشـوری دورگـەی عـەرەب، ئەمانـە هـەمویان دوژمنـانی خەتەرناکی کۆمەڵی ئیسلامی بـون، ئـەم کۆمەڵـە بچوکە ئیسلامی یـە دەبوایـە ئامبازی ئەم هەمو هێزانە بێت، بێ شك خۆشیان نیگەران بون، کە چ ئـەرکێکی گەورە و چ گروهێکی بچوك.

خودا ئەم هەقیقەتەمان حاڵی دەکات، کە: بەرنامەیـەك کـە دابینـی دەکـەن بەرنامەیـەك، کـە قورئـان فێرتـان دەکـات، توانـای قورئـان بەئەندازەیەکـە، کـە

ئەگـەر بمانـەوێت بـە نمونەیـەکی مـاددی و عـەینی دەری بـبڕین دەڵـێین وەك مادەیەکی تەقێنـەرەوەی زۆر بـەهێز، کـە ئەگـەر بخرێتـە سـەر کێـوێکی گـەورە داغان و کاولی دەکات و لەناوی دەبات.

ئەم کێوەی ڕژێم و حکومەت و پەیوەندی یە کۆمەلایەتییانـەی، کـە بـەدیان هێنـاوە، هـەروەها ئـەو خێـلّ و تـیرەو هـۆزە زۆرمەندانـەو ئـەو حکومەتـە بەدەسەلاتانەی، کە هەیە لەبەرامبەر ئێوەوە، کە —ئەهلی قورئان- ن بێ توانـان و بەرگریان پێ ناکرێت قورئـان ماددەیـەکی تەقێنەرەوەیـە، کـە ئەوانـە پارچـە پارچەو داغان دەکات. بەڵێ ئەو دەسەلاتە زۆردارانە لەبەر چاوی ئێوەدا زۆر بە هەیبەتن وەکو شاخ و کێـو (لـە زمـانی کوردیـدا بەهـەمان شـێوە، کـە لـە زمـانی عەرەبی دا هەیە دەسەلات و بەهێزی بەکێو دادەنێن) تۆ وادەزانیت و پێت وایە کە ئەمانە ڕیشە کەن نابن و لەناو ناچن، بـەلام ئێـوە قورئانتـان پێیـە قورئـان بەسـە بـۆ ئـەوەی گـەورەترین کێـو وردو خـاش و پارچـە پارچـە بکـات، وەك دەزانین بەهەمان شێوەش بو.

محمد ﷺ بەهۆی قورئانەوە ئەو کۆمەڵە بچوکەی پەروەردە کـرد، کـە تـوانی هـەمو هێـزە گـەورەکان نـابوت بکـات، پـەروەردە کردنێـك بەوشـێوەیە، پاشـان فێرکردنیان.

پەروەردە بۆ چ کەسانێك؟

بۆ ئەو مرۆڤانەی بـەپێی شـێوازی بیرکردنـەوەو هەلوێستیان نیـەتی پـاك و ئامانجی دروستیان هەیە.

پەروەردە — بەو شێوەیەی لـە نامیلکـە دەرسـییەکاندا نوسـیومانە — بریتـی یـە لـە: دروسـت کردنـی کەسایەتی هـەر مرۆڤێـك ڕێـك و هـاو هـەنگاو لەگـەڵ ئەوەدا، کە فێری دەبێت.

سەرەتا زانیاری زۆری پـێ نادرێـت، چونکە ئەگـەر بـەم شـێوەیە بکرێـت لـە پاشـاندا ناتوانرێـت ئـەو زانیـاری یـە زۆرە بخاتـە کـردارەوە، بـەڵکو کـەم کـەم هەقیقەتە گەورەکانی حاڵی دەکەیت و شەخسیەتی بەپێی ئەم هەقیقەتانە پـێ

دەدرێـت، بـە عیبـارەتێكی سادەو ناوخـەڵكی یـەك دەسـتی دەكـەیت، ( نایـەڵێت شـتی زۆر بزانیـت و پـەروەردەی كـەم)، هـەمان مەسـەلەی دەرونـی هۆشـیارو ناهۆشـیارە، مـرۆڤ كۆمـەڵێك شـت دەزانێـت و سـیفات و تایبـەت مەنـدی یـەكی تایبەتی هەیـە، پـەروەردە ئەوەیـە، كـە مـرۆڤ شـان بـە شـانی ئـەوەی دەیزانێـت سیفاتی گونجاو لەخۆیدا بـەدی بهێنێـت، یـەك جـۆرە پـەروەردە دەبێـت و یـەك شێوە بێت و نـەك دوو شێوەو دوو شەخسیەتی بێت و كردەوەی شـتێك و زانـین و هۆشـیاری شـتێكی تـر، ئـەوەی دەیزانێـت چەشـنێك و سـیفات و ڕەوشـت و ڕەفتاری چەشنێكی تر.

بە عیبارەتێكی تر:بەدی هێنـانی دابـین كـردن –تطبیـق- لـە نێـوان تایبـەت مەنـدی یـە ئـەخلاقی و ویـژدانی و دەرونیـەكانی مـرۆڤ و حـاڵ و ئـەحواڵی – زەینی- بیری دا.

مەبەستمان لـە زەیـن –ذهـن- چالاكی بـیری و دەرك و زانـین و ناسینەكانی مرۆڤە، ویژدان یان ئەخلاق یان دەرون واتە ئەو سیفات و تایبەتمەنـدی یانـەی كە مرۆڤ هەیەتی بۆ نمونە ئازایە یا ترسنۆكە، سەخاوەتی هەیـە یـان چـروك و چەكلە، خۆش ڕەفتارە یان بەد ڕەفتارە، خۆڕاگرە یان بێ ورەیە هـەروەها بـاقی سـیفەتەكان، پـەروەردەی ڕاسـت و دروسـت واتـە بـەدیهێنانی دابـین كـردن و هاوشانی لە نێوان تایبەتمەندی یە ئەخلاقی و ویژدانییەكانی مرۆڤ و ئەحواڵی زەینی دا –ذهن- ئەوەی زەین و هۆشی بەدەستی دەهێنێـت، بەهـەمان شـێوە لـە ویژدانیشـیدا بەرهـەم بێـت، چـی فێردەبێـت هـەر ئـەوە لـە سـیفات و تایبـەت مەندیەكانی دا بەدەست بهێنێت، یـان دیسان بـە عیبـارەتێكی تـر هـاو هـەنگاو كردن و هاو ڕەنگ كردنی دەرونی هۆشـیارو نـا هۆشـیار، دەرونـی هۆشـیاری كـە فێـری شـتێك دەبێـت حەتمـەن دەرونـی ناهۆشـیاری ئـەو شـێوەیە وەربگرێـت، پەروەردەی ڕاست و دروست واتە ئەمـە، دوای ئـەوەی لـەم قۆناغـەدا كەسـانێكی پاك و یەك ڕەنگ وساز دروسـت بـون نـۆرەی فێربـونی –كتـاب وحكمـت- دێـت

ســـەرەتا: ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ﴾ و پاشـــان ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ دێت، پاش ئەوەی ئـەم شەخسیەتەی گەرەکتـە دروستبو، واتـە: ئەم کەسە بوە مرۆڤێکی بـە سود و بـەجێ لەپایـەو بناغـەو بـە دروستی بـەرز بـوەوە، زانـین و ناسینە سـەرەکی یـەکان فێربـو، ویـژدان و دەرونـی هاوشـێوەی زانینەکان بو، نۆرەی فێرکـردن دێـت فێرکردنـی – کتـاب و حکمـت - بـەردەوام زانیاری یەکانی زیاتر دەبێت و ڕاستی زۆرتر دەرك دەکات، تا هەر ڕادەیەك کە ئەو کەسە زەمینەو وەختی هەڵدەگرێت، بێ گومان هـەمو کەسـەکان وەك یـەك نین، بۆ فێربون، هەرکەسێك بەپێی توانـای خـۆی دەتوانێـت لـە ڕاسـتیەکانی – کتاب و حکمت- (ئەوەی، کە مرۆڤ دەتوانێت فێر بێت). حاڵی بێـت و فێـر بێـت و تێ بگات.

کەواتە بنەمای بەرنامەی ئەم دینـە ئەوەیـە، کە هـەمو مرۆڤێـك پـەروەردە ببێت واتە: ئەوەی فێری دەبن هەر بەو شێوەیەش بن – لەکردەوەیان دا-، یـان بڵێین: ئـەوەی لـە ڕێگـای دەرونـی هۆشـیارەوە وەری دەگـرن و قبـوڵی دەکـەن بەهەمان شێوەش دەرونی ناهۆشیاریان بڕازێننەوە، لـەم پەروەردەیـەدا دەرونـی هۆشیارو ناهۆشیار لەیەك بێگانە نین (واتە زانین و سەرئەنجام قسەیان لەگـەڵ ڕەفتاریاندا جوتە).

لـە غـەیری پـەروەردەو شـێوازی مـرۆڤ سـازی ئیسـلامی دا سـەرنج دەدەیـن دەرونی هۆشیارو ناهۆشیار تەواو لە یەك بێگانەن.

یەك پزیشکی دەرونـی یـان دەروناسـێك خـەریکی باسـێکە لەگـەڵ کەسـێکدا، سـەیر دەکـات ئـەم کەسـە زۆر چـاك مەسـەلەکانی مـرۆڤ تـاوتوێ دەکـات، دوای ماوەیەك زەحمەت کێشان تێدەگات ئەم کەسە لە دەرونەوە زۆر وێرانە، دەرونی تایبەت مەنـدی یـەکی هەیـە دروست پێچەوانەی ئـەوەی دەیڵێت و دەیزانێت، هۆکاری ئەم بێگانەیی و نا ئاشنایيەی دەرونی هۆشیارو ناهۆشیاری مرۆڤ چیە؟

ئەوەیە كە لە سەرەتادا وتمان، دوو دەفر لەتەنیشت یەكترەوە، بەلاّم جیا لەیەك، یەكێكیان بەردەوام پڕ دەكرێت و دیارە هەر پڕو پڕتر دەبێت و ئەوەی تریان هیچی تێ ناكرێت و بەتاڵ و خاڵی دەمینێتەوە، یەكێكیان زۆر ڕوناك دەكەنەوەو دەیكەنە چراخان، ئەوەی تریان تاریك، واتە: بەشی هۆشیارو ئاگای مرۆڤ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەكرێت، بەلاّم بێ ئەوەی گوێ بدەنە دەرونی نا ئاگای.

ئایە ئەم كەسە وێڕای زانینەكەی پەروەردەی دەبێت؟

نەخێر.

لــە شــێوازە غــەیرە دینــی یەكانــدا مــرۆڤ ســازی تــەنیا زیــاتر كردنــی زانیاریەكانیەتی بێ ئەوەی گوێ بدەنـە سیفات و تایبـەت مەنـدی یـەكانی ئـەو كەسە، سەرئەنجام ئەم دوو شەخسیەتی یە بەدی دێت، كـە باسمـان كـرد، بـەلاّم لە پەروەردەی دینی دا دەرونـی هۆشـیارو ناهۆشـیار لەیـەك بێگانـە نـین بـەڵكو دەرونـی ئاگـاو هۆشـیاری ئـەو كەسـە ئـەوەی فێـری دەبێـت وەك بڕاجكتـەرێك دەرونی نائاگای خۆی پێ ڕونـاك دەكاتـەوە، تـا بـەپێی زانینـەكانی شەخسیەتی دابمـەزرێت، كاتێـك دەرونـی ناهۆشـیار بـەم شـێوەیە پـەروەردە دەبێـت هـەر چـەندێك زانیـاری یـەكانی زیـاتر بكـات، وەك چـرایەك وایـە، كـە لـە دەرونـی هۆشیارەوە بەرەو دەرونی ناهۆشیار دانرابێت، تـا بـەردەوام ڕونـاكتری بكاتـەوەو بەتەواوی وەك خۆی بەرەو پێشكەوتنی ببات، دروست وەك ئـەو وێنەیـە وایـە، كـە لەبەرامبـەر ڕوناكیـەكی زۆر شـێوەی دەكەوێتـە سـەر شـتێكی تـر، دەرونـی ناهۆشیار بـەهۆی پڕشـنگداریەك، كـە دەرونـی هۆشـیار دەیكات هـەمان شـێوەی دەرونــی ئاگــای بەدەســت دەكــەوێت، واتــە زانــین و ســیفەت و تایبەتمەندیــە مرۆڤانەكەی وەك یەكی لێدێت.

مرۆڤێـك، كـە بـەم شـێوەیە پـەروەردە بێـت دووچـاری نەخۆشـی نـەنگین و زیانمەندی تاكی و كۆیی (فەردی و جماعی) ناكۆك –متعارض- لـە شەخسیەتدا نابێت، یان دوو شەخسیەتی بون و ئاكامە شومەكانی وەك ڕیاكاری و دوو ڕویی و فێڵ بـازی و نمونـەی ئەمانـەی نابێـت بێگانـەیی دەرونـی هۆشـیارو ناهۆشـیار

مرۆڤ توشی نەخۆشی دوو شەخسیەتی دەکات، کارێـك دەکات یـەك دەسـتەیی و یەك بڕیاری لەدەست دەربچێت وتوشی جۆرەها نەخۆشی تاکی و کۆمەلأیـەتی ببێت.

واتە: هەم ئەو تاکە خۆی و هەم ئەو کۆمەڵەی لەو کەسانە پێکهاتوە، توشی چەندین نەخۆشی دەبێت، کەسێك شتێك بزانێت، بەڵام ڕەوشت و سیفەتەکانی وەك زانینەکەی نیە دەبینین، کە ئەم کەسە دەتوانێت فێڵبازو ڕیاکارو درۆزن بێت، لەبەر ئەم ناکۆکی و دوو لایەنە بونەیە، کە دوچاری دوو شەخسیەتی بوە، هەمو کاتێك ئەم دوو شەخسیەتیانە بەئەندازەی یەك خراپ نین، نەخێر بەڵام دوو شەخسیەتی بون بنەمایە بۆ توش بونی هەمو نەخۆشییەکانی دوو ڕەنگی و ڕیاو فێڵ و تەڵەکە بازی.

کەواتە دوای پەروەردە کردنەکە نۆرەی فێرکردنی تەواو دێت، شێوازی پەروەردەو فێرکردن لە ئیسلامدا ئەمەیە: ئێستا ئێمە، کە مەکتەبی خۆمان ناو ناوە —مەکتەبی قورئان- و دەمانەوێت لەم قوتابخانەیەدا شێوازی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامی زیندوبێتەوە. مامۆستایانی ئەم مەکتەبە لەم خولەدا (خولی یەکەم) دەبێت بزانن، کە دەبێت لەسەر بنەمای ئەم شێوازە محمدیە ( واتە شێوازێك کە خودا بە محمدی( ﷺ) فێرکردوە نەك شێوازی خۆی بێت) سەرەتا پەروەردە کەرو ڕاهێنەرن، هەر ڕادەیەك بەپێی خۆی، ڕادەی بەرنامەکان جۆراوجۆرەو هەر مامۆستایەك لەهەر ڕادەیەکدا، کە دەرس دەڵێتەوە سەرەتا پەروەردە کەرو ڕاهێنەرە پاشان مامۆستاو فێرکەرە.

والسلام

الحمد لله الذي هدانا لهذا

تەواو بوو

١٩٩٤/١١/٥


لە ساڵەکانی مەلایەتیدا


لە دوا قۆناغەکانی فەقێیەتی و سەرەتاکانی مەلایەتیدا




مەلا محمودی موفتی (باوکی)



بەر لە زیندان
لە گەرمەی بەحس و
دیراسەکانی







لەکاتی دوعاکردن بۆ
مصعب خالد
١٩٨٠





سەردەمی
شۆڕش و
ئینقلاب و
هەڵبژاردنی
ئێران
١٩٧٩





مالّەکەی کاك احمد
لە (سنە)







گۆڕی کاك ئەحمەد
لە گۆڕستانی شێخ حەمەباقی لە
(سنە)

## ناوەرۆك

